# گەورە گرتنی زانست

## تعظيم العلم

نووسینی:

شيخ صالح بن عبدالله بن حمد العصيمي

وەرگێڕان و ڕاڤە کردنی:

مصطفى محمد جعفر (گوڵی)

١٤٤٠ ک - ٢٠١٩ ز

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا وسيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا إله الله وحده لا شريك له، وأشهد أن محمدا عبده ورسوله.

﴿يا أيها الذين آمنوا اتقوا الله حق تقاته ولا تموتن إلا وأنتم مسلمون﴾

آل عمران: ١٠٢

﴿يا أيها الناس اتقوا ربكم الذي خلقكم من نفس واحدة وخلق منها زوجها وبث منهما رجالا كثيرا ونساء واتقوا الله الذي تساءلون به والأرحام إن الله كان عليكم رقيبا﴾ النساء: ١

﴿يا أيها الذين آمنوا اتقوا الله وقولوا قولا سديدا * يصلح لكم أعمالكم ويغفر لكم ذنوبكم ومن يطع الله ورسوله فقد فاز فوزا عظيماً﴾

الأحزاب: ٧٠ و٧١

أما بعد:

فإن أصدق الحديث كتاب الله، وأحسن الهدي هدي محمد صلى الله عليه وسلم، وشر الأمور محدثاتها، وكل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة، وكل ضلالة في النار.

# پێشەکی

بێگومان گەورەگرتن و بەرزڕاگرتنی علم لەسەر هەموو موسڵمانێک و بەتایبەتی لەسەر تەلەبەی علم واجب و پێویستە، جا لەبەرئەوە و لەسەر داوای مامۆستایەکی بەڕێز و برایەکی خۆشەویستمان و لەبەر گرنگی بابەتەکە هاتین ئەم بیست بنەما و بنچینەیەی صالح عوصەیمیمان وەرگێڕا کە لە گەورەگرتن و بەرزڕاگرتنی علمی شەرعی و سودبەخشدا نوسیویەتی، پاشان بۆ خۆشمان لە راڤەکەی سەری و لە هەندێک سەرچاوەی دیکە راڤەیەکی مامناوەندمان لەسەر کرد.

هیوادارین کەڵک و سوودی بۆ تەلەبەی علم و خوێنەران ببێت و خواش لە ئێمەی وەربگرێت، وبالله التوفیق ، وصلی الله علی نبینا محمد وعلی آله وصحبه وسلم .

## بنچینەی یەکەم
## خاوێنکردنەوەی جامی زانست

مەبەست بە جامی زانست دڵە، چوون بۆ هەموو خواستراوێك جامێك (دەفرێك) هەیە، وە جام یاخود دەفری زانستیش دڵە، چونکە دڵ زانستی تێدا کۆدەکرێتەوە و دەپارێزرێت، وە بەهەڵخهێنان و کلسکردنی جام لێڵی دەکات و ئەوەی ناوی دەگۆڕێت، وە دڵ بە پێی پاك و خاوێنی ی زانستی تێدەچێ، وە کاتێك پاکوخاوێنی دڵەکە زیاد بکات، قابیلیەتیشی بۆ زانست زیاد ئەکات.

وە نمونەی زانست لە دڵدا وەك ڕووناکی چرا وایە، ئەگەر چرا بلوورەکەی صاف و خاوێن بێت، ڕوناکیەکەشی بڵاو ئەبێتەوە، وە ئەگەر هێس و بەڵخ بیگرێت ، ئەوا ڕوناکییەکەی تەڵخ دەبێت و تاریك دادێت.

جا ئەوەی ئەیەوێ زانست بەدەست بهێنێت، با دڵی لە پیسی خاوێن بکاتەوە و ناخی بڕازێنێتەوە، چوون زانست گەوهەرێکی قەشەنگە[1]، بۆ هیچ شتێك ناگونجێت ئیللا بۆ دڵێکی خاوێن نەبێ.

وە پاکو خاوێنی دڵیش ئەگەڕێتەوە بۆ دوو ئەسڵی گەورە:

---

[1] مەبەست بە زانست: زانستی سوودبەخشە، ئەوەی زەخیرەیە بۆ بەندە لە دونیا و ئاخیرەتدا.

**یەکەمیان: پاکوخاوێنی لە پیسی گومانەکان:** (طهارته من نجاسة الشبهات).

**دووەم: پاکوخاوێنی لە پیسی ئارەزووەکان:** (طهارته من نجاسة الشهوات).

**وە لەبەر ئەوەی پاکوخاوێنی دڵ پێگەیەکی گەورەی هەیە، و یەکەم شتێك کە خوا فەرمانی بە پێغەمبەر ﷺ کرد فەرمانی بە طهارەتی دڵ پێکرد لە فەرمایشتی خۆیدا:** ﴿وثيابك فطهر﴾ (المدثر: ٤)، **ئەمە لە وتەی ئەوانەی وشەی** (ثياب)**یان لە ئایەتەکەدا بە ناخ و باتینی مرۆڤ ڕاڤە کردووە، وە ئەویش وتەیەکی جوانە و ئەسڵێکی دروستی هەیە.**

**وە لەنێوان ئەم ئایەتە و ئایەتی دواتردا تەناسوب هەیە، هەربۆیە حەملیان کردوەتە سەر خاوێنکردنەوەی دڵ لەو پیسیانەی سەر دڵ دەکەون لە پیسی شیرك و بیدعەت و مەعسیەت.**

**وە کاتێك تۆ شەرم دەکەیت لە ڕوانینی مەخلوقێکی وەك خۆت بۆ چڵك و چەپەڵی جلەکەت، دەسا شەرم بکە لە ڕوانینی خوا بۆ دڵت لە کاتێکدا پیسی تێدا بێت بە هەموو بەشەکانیەوە.**

**پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی:** (ان الله لاينظر الى صوركم وأموالكم، ولكن ينظر الى قلوبكم وأعمالكم) رواه مسلم.

**واتە: خوا ناڕوانێ بۆ شێوەتان و سامانتان، بەڵ دەڕوانێ بۆ دڵتان و کردەوەکانتان.**

واحذر كمائنَ نفسك اللاتي متى خرجتْ عليك كُسِرْتَ كسْرَ مُهانِ

**واتـه: وریـای بۆسـەکانی دەرونـت بـە، چـون هـەرکاتێك لێـت دەرچوون دەشکێندرێیت بە شکانی ئیهانەکراو.**

**ئـەوەی دڵـی خـاوێن بکاتـەوە زانـست جێـدەگریٚ تێیـدا، بـە پێچەوانەشەوە زانست جێی دەهێڵێت و باردەکات. وە کاتێك تەماشای ئـەحواڵی تائیفەیـەك لـە زانـستخوازانت کـرد، ئـەوا خەلـەلێکی ڕوون دەبینیـت، کـوانیٚ تـەعزیم و بـەرزڕاگرتنی زانـست لـە کەسـێکدا کـە ئارەزووەکان و گومانەکان بەیانی و ئێوارە لەناو دڵیدا تەراتێن بکەن؟**

**وێنەیەکی حەرامکراو بانگهێشتی دەکات و مەقالەیـەکی جورمـدار کـاری خـۆی تێـدا دەکـات، ئـاخنینی مونکـەرەکان و چـێژ بیـنین لـە حەرامکراوەکان و کینە و فەساد و ئیرەیـی و عینـاد، و نیفـاق و شیقاق تێیدا، لەکویٚ و عیلم لە کویٚ؟! ئەوان لەو نین و ئەویش لەوان نیە.**

**سـەهلی کـوڕی عبـدالله التـستری فەرموویـەتی:** (حرام على قلب أن يدخله النور وفيه شيء مما يكرهه الله عزوجل).

**واتە: قەدەغەیە لەسەر دڵێك کە ڕونـاکی تێبـچێت و شـتێك لـەوەی تێدا بێت خوا ڕقی لێبێت.**

## بنچینەی دووەم

## ئیخلاصی نیەت تێیدا

**بێگومان ئیخلاصی کردەوەکان ئەساسی قەبوڵبوونیان و پەیژەی گەیشتنیانە، خوای باڵا فەرمویەتی: ﴿وما أمروا الا ليعبدوا الله مخلصين له الدين حنفاء﴾** (البينة: ٥)

**عن عمر رضي الله عنه أن رسول الله ﷺ قال: (انما الأعمال بالنيّة، ولكل امرئ مانوى) رواه البخاري ومسلم واللفظ للبخاري.**

**واتە: هەرچی کار و کردەوە هەیە بە نییەتە، وە هەموو کەسێك ئەوەی بۆ هەیە نیەتی بووە.**

**ئەوەی پێشکەوتووە بۆلای خوا و گەیشتووە بە خوا لە سەلەفی صالح بە ئیخلاص بووە بۆ خوای خولقێنەری جیهانەکان.**

**ابوبكر المَروذِيّ فەرمویەتی: گوێم لە پیاوێکەوە بوو باسی ڕاستگۆیی و ئیخلاصی بۆ (أبو عبدالله) یانی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ئەکرد، ئیمام احمد فەرمووی: (بهذا ارتفع القوم) واتە: ئەو کۆمەڵە (سەلەف) بە ڕاستگۆیی و ئیخلاص بەرزبوونەوە و گەیشتن بەو پلەیە.**

**هەڵبەت زانستخواز بە ئەندازەی ئیخلاصی بۆ خوا (لە زانستدا) زانست بەدەست دەهێنێت.**

**وە ئیخلاص لە زانستدا لەسەر چوار بنەما دەوەستێت:**

**<u>یەکـــەم:</u> هـــەڵگرتنی جـــەهل لەســـەر خـــۆت بـــە زانـــینی ئـــەوەی لەسـەریەتە لەعەقیـدەو پەرستـشەکان و ڕاگـرتنی لەسـەر (مەقاصـد)ی ئەمر و نەهی.**

**<u>دووەم:</u> هەڵگرتنی جەهل لەسەر خەڵك بە فێرکردنیان و ڕێنماییان بۆ ئەوەی صەلاح و خێری دونیا و ئاخیرەتیانی تێدایە.**

**<u>سێیەم:</u> ژیاندنەوەی زانست و پارێزگاریکردنی لە زایە بوون.**

**<u>چوارەم:</u> کارکردن پێی.**

**عیلم درەختـــەن عـەمەل سەمەرەن**

**عیلمی بیٚ عەمەل بـاخـی بێبـەرەن**

**عیلم هەر بۆ عەمەل ئەویستریٚ و عەمەلیش بۆ خوا.**

**هەڵبـەت سـەلەف رحمهـم الله لـە نـەمانی ئـیخلاص لـە تەڵـەبیان بـۆ عـیلم دەترسـان، هەربۆیـە خۆیـان لـە ئیـددیعا کردنـی ئەپاراسـت، نـەك لەبەر ئەوەی تەحقیقیان نەکردبیٚ لە دڵیاندا... بەڵکو لەبەر ئـەو ترسـەی کە هەیانبوو لە نەمانی ئیخلاص.**

**هیــشامی دەســتەوانی ئەفــەرمویٚ:** (والله، ماأستطيعُ أن أقول: إنـي ذهبتُ يوماً أطلبُ الحديثَ أريدُ به وجه الله عزوجل).

**والله، نـــاتوانم بڵـــێم: ڕۆژێـــك ڕۆشـــتووم تەڵـــەبی حـــەدیس بکـــەم مەبەستم پێی ڕوخساری خودا بووبێت.**

**وە پرسیاریـشیان لـە ئیمـام احمـد کـرد:** هـل طلبـت العلـم لله؟ **ئایـا تەڵەبی عیلمت بۆ خودا کردووە؟ فەرمووی:** (لله ! عزيزٌ، ولكنّه شيء حُبِّبَ

إليَّ فطلبتهُ) بۆ خودا! کەم، بەڵام شتێك بوو لام خۆشەویست کرابوو منیش تەڵەبم کرد.

ئەوەی ئیخلاصی زایە کردبێ، ئەوە عیلمێکی زۆر و خێرێکی فراوانی لەدەست چووە.

واشیاوە بۆ ئەوەی سەلامەتی مەقسودە بەدوای ئەم بنەمایەدا، واتە: (بەدوای ئیخلاصدا) بگەڕێت لە هەموو کاروبارێکدا، ورد و درشت، نهێنی و ئاشکرا. وەلەسەر ئەم بەدوادا گەڕانەشدا سەختی چارەسەرکردنی نیەت تەحەمول بکات و خۆی ماندوو بکات.

سوفیانی ثەوری فەرموویەتی: (ما عالجت شيئاً أشدَّ علي من نيتي، لأنها تتقلَبُ عليّ).

هیچ شتێکم موعالەجە نەکردووە لەسەرم سەختر بووبێت لە نیەتم، چوون نیەتم لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێك ئەگۆڕا.

سولەیمانی هاشمی فەرموویەتی: (رُبّما أحدث بحديث واحد، ولي نيةٌ، فإذا أتيتُ على بعضه تغيّرت نيتي، فإذا الحديثُ الواحدُ يحتاجُ الى نيّات).

وادەبێ زۆرجار فەرموودەیەك ئەگێڕمەوە، نیەت و مەقسەدێکی باشم هەیە، کاتێك چوومەتە سەر هەندێکی نییەتم گۆڕاوە، کەوابوو یەك فەرمووده پێویستی بە چەند نیەت هەیە. واتە: ئینسان تێیدا پێویستی بە تەصحیحی نییەت هەیە، مەبەست بەوە رەدی نیەتە بۆ ئەوەی

فەرمانی پێکراوە کاتێ کە شتێکی بۆ پەیدابوو، وە گۆڕیبووی[٢] یاخود فاسد و پووچی کردبووەوە، چوون نییەت ئەبێ بە وەفقی فەرمانپێکراو بێت، واتە: بەپێی فەرمانی شەرع بێت.

خوایە نیەت و مەقصەدمان صاف و خاوێن بکەیت بۆ خۆت.

[٢] گۆڕیبووی: واتە: لە صەلاح و چاکێتیەوە دەریکردبوو بۆ دژەکەی، یانی بۆ ئیراد و ویستێکی حەرامکراو.

## بنچینەی سێیەم
## کۆکردنەوەی هیمەتی نەفس لەسەری.[٣]

بێگومان پەرت و بڵاوی نەفس کاتێك کۆکرایەوە لەسەر عیلم یەك ئەگرێتەوە و کۆ ئەبێتەوە، وە کاتێکیش مەشغوڵ کرابوو بە عیلم و بەشتی دیکەوە پەرت و بڵاوی زیاد ئەکا. هەڵبەت هیممەت لەسەر خواستراو (مطلوب) کۆ ئەکرێتەوە بە بەدوادا چوونی سێ شت.

<u>یەکەمیان:</u> پێداگری لەسەر ئەوەی سوودی بۆی ئەبێ، جا هەرکاتێك بەندە موەفەق بوو، واتە: خوا تەوفیقی دابوو بۆ ئەوەی سوودی پێدەگەیەنێت پێداگری لەسەر ئەکات.

<u>دووەمیان:</u> کۆمەکخواستن و ئیستعانە بە خوا لە حاسڵکردنیدا.

واتە: لە تەحسیلی ئەوەی سوودی پێدەبەخشێت.

إذا لم يكن عونٌ من الله للفتى  فأول مايجني عليه اجتهادُه

واتە: ئەگەر کاتێك یارمەتی و کۆمەك لە خواوە بۆ ئینسان نەبوو ئەوە یەکەم شت جینایەت و تاوانی لە دژ ئەکات ئیجتهاد و خۆ ڕەتاندنەکەی خۆیەتی.

---

٣ واتە کۆکردنەوەی هیممەتی نەفس لەسەر عیلم بەوەی بە ئیرادەیەوە ڕووی تێبکات، ئیتر بە هیچی دیکەوە خەریك نەبێ.

لەبەر ئەوە گەنج و (طالب العلم) و هەرکەسێکی دیکە ئەگەر مەعونەت و یارمەتیدانی خوای لەگەڵ نەبێ، ئەوە یەکەم شت دەرگای شەڕ و خراپە و تاوانی بۆ دەخاتە سەر پشت ئیجتهاد و هەوڵەکەیەتی بە نەفسی خۆی و بێنیازییەتی لە خوای بالاّ بە کۆمەککردنی و تەوفیقدانی.

سێیەمیان: دەستەوسان نەبوون لە گەیشتن بەوەی ئەیەوێ لەو خواستراوەی سوودی بۆی ئەبێت.

وە ئەو سیانە لەو فەرمودەیەی موسلیم بە سەنەدی خۆی لە پێغەمبەرەوە گێڕاویەتیەوە کۆکراوەتەوە کەئەمە دەقەکەیەتی: (احرص على ما ينفعك، واستعن بالله، ولا تعجز).

ئیدی ئەوەی ویستی هیممەتی کۆبکاتەوە لەسەر عیلم، دەبا مەشخەڵی پێداگری لە سەری هەڵکات، چوون سوودی پێدەگەیەنێت، بەڵ هەموو خێرێك لە دونیا و ئاخیرەتدا سەمەرێکە لە سەمەراتی عیلم (چوون عیلم ئەسڵی هەموو خێرێکە[4])، وە با ئیستعانە بە خوا بکات لەسەری و کۆمەك لەو بخوازێ و دەستەپاچە نەبێ لە هیچ شتێك لە

٤ ئەم وتەیە ئیمامی (القرافي) لە (الفروق)دا باسی کردوە. وە ئیمام (ابن القيم)یش فەرموویەتی: (أصل كل خير في الدنيا والآخرة العلمُ والعدل وأصل كل شر في الدنيا والآخرة الجهل والظلم)، ئەویش ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئەلقەرافی باسی کردووە، چوون ئەوەی عیلمی نەبێ تواناشی لەسەر عەدل نابێ، کەوابوو ئەصڵی خێر هەمووی هەر بۆ عیلم ئەگەڕێتەوە.

**زانست، بێگومان ئەو کات بە خواستراوەکەی دەگات و ئەوەی هیوای بۆ خواستووە بەدەستی دەهێنێت.**

**جونەید ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرمویەتی:** (ماطلب احدٌ شيئاً بجدّ وصدق الا ناله، فإن لم يَنلْه كلَّه نال بعضه).

**واتـــە: هـــیچ کەســـێك تەڵـــەبی شـــتێکی نـــەکردووە بـــە جـــددی و ڕاستگۆیی ئیللا پێی گەیشتووە، ئەگەر بە هەموویشی نەگەیشتبێت بە هەندێکی گەیشتووە و دەستی خۆی خستووە.**

الجدُّ بالجدّ والحِرمان بالكسل     فانصَب يُصِبْ عن قريب غايةَ الأمل

**ئـەم بەیتـە شـیعرە هـەمان واتـای وتەکـەی جونەیـدی بەغـدادی دەبەخشێت.**

**دەسا بە هیممەتەوە ڕاپەڕە و لە غەفڵەت و بێئاگایی بێداربەرەوە، چـوون بەنـدە کاتێـك هیممـەتێکی بـەرزی پێبەخـشرابوو، دەرگاکـانی خێراتی بۆ دەکرێتەوە و خۆشیەکانیش پێشبڕکێ دەکەن کامیان زووتـر بگەنە لای.**

**ئیبنولقـەیم رحمـە اللە لـە کتـێبی** (الفوائد)**دا فەرمویـەتی:** (اذا اطلع نجمُ الهمة في ظلام ليل البطالة، ورِدفه قمرُ العزيمة، أشرقتْ أرضُ القلب بنور ربها).

**کاتێك ئەستێرەی هیممەت هەڵهات لە تاریکایی شەوی بێکاریدا و مــانگی عەزیمــەتیش دوای کــەوت، ئــەوکات زەوی دڵ بــە ڕونــاکی پەروەرێنی گزنگ دەدات.**

وە ئـەوەی هیممـەتی پەیوەسـت بـوو بـە جـل و بـەرگ، یـاخود خواردن، یاخود خواردنەوەوە، بۆنی عیلم ناکات.

واعلم بأَن العـــلم ليس ينالهُ          من همُّهُ في مطعـــم أو مَلْبَسِ
فاحرص لتَبلُغَ فيــه حظاً وافراً          واهــجُره له طيب المَنام وغلِّس

ئەوەی شاعیر فەرموویەتی هەمان واتا دەبەخشێت، ئەوە نەبێت (طالب العلم) هان ئەدا حیرصی لەسەر عیلم هەبێ بۆ ئەوەی بگات بە شتێکی فراوان لە عیلمدا، وە هانیشی ئەدا واز لە خەوی خۆش بهێنێت و لە تاریکایی ئاخری شەودا بەئاگا بێت و هەوڵ بۆ عیلم بدات.

ئیعتباری حاڵی ئەوانەی پێشوو، و بەئاگا بوون لە هیممەتیان لەو شتگەلەیە (طالب العلم) بە هیممەت دەکات و نەفسی بەرە و بالآ دەبات.

ئەوە (ابو عبدالله احمد بن حنبل) ئەو لە کاتێکدا لە تەمەنی منداڵیدا بوو زۆرجار ئەیویست پێشی فەجر (بەرەبەیان) بڕوات بۆ ئەڵقەی وانە وتنـەوەی شـیوخ و مامۆسـتایانی وانـە، دایکـی لـەڕووی بەزەییـەوە کراسەکەی دەگرت و دەیوت: جاریێ مەڕۆ هەتا بانگبێژ بانگ دەفەرموی یاخود ڕۆژ دەبێتەوە، واتە: سپێدە دەردەکەوێ.

ئەبوبەکری خـەطیب (خـەطیبی بەغـدادی) کتـێبی (صحيح البخاري) هەرهـەمووی لـە خزمـەتی ئیـسماعیلی حـیری لـە سـێ مـەجلیس و دانیـشتندا خوێنـدووە، دووانیـان لـە دوو شـەودا لـە وەخـتی نوێـژی مەغریبـەوە بـۆ نوێـژی بـەیانی، وە ڕۆژی سـێیەم لـە دوای هـەڵهاتنی

**خـۆرەوە بـۆ نوێـژی مـەغریب و لـە مەغریبـشەوە بـۆ هـەڵهاتنی فـەجر خوێندوویەتی.**

**ئیمامی ذەهـەبی لـە کتێبـی** (تأريخ الاسلام)**دا فەرموویـەتی:** (وهذا شيء لا أعلم أحداً في زماننا يستطيعه).

**واتـە: ئەمـە شـتێکە نـازانم کەسـێك لـە زەمـانی ئێمـەدا ببێـت ئـەوە بتوانیٚ[5].**

**ڕەحمەتی خوا لە** (ابو عبدالله) **بێت، چی ئەفەرموو ئەگـەر هیممـەتی ئەهلی ئەم زەمانەی ئەبینی؟!**

**وە** (ابو محمد ابن التَّبّان) **سەرەتای دەسپێکردنی هەموو شەوەکە بۆ خۆی ئەیخوێند، هەتا دایکی بەزەیی پێدا ئەهاتەوە و ڕێگری ئەکرد لـە خوێنـدن بەشـەو، ئـەویش چـراکەی هەڵـدەگرت و دەیخـستە ژێـر کاسـەیەکەوەو وای پیشان ئـەدا خـەوتووە، جا کاتێـك دایکـی دەخـەوت چراکەی دەرئەهێنا و ئەچووەوە سەر دەرسەکە.**

---

**٥ شێخ وتویەتی: ئەوەی ذەهەبی باسی کردووە مەبەستی** (استعظام) **بووە، واتە: بەگەورە بینیی کارەکە بووە نەك ئەوەی هیچ کەسێکی دیکە ئەوە بە قەتعی نەتوانیٚ... بەڵکو باسی** (ابن طولون) **دەکات کە لەسەدەی دەیەمی کۆچیدا ژیاوە و لە زانایانی سەدەی دەهەم بووە، ئەویش لەسەر ئەو شێوەیەی خەطیبی بەغدادی لەلای یەکێك لە شێخەکانی** (صحيح البخاري) **خوێندووە. بیرمان نەچیٚ** ابن طولون **زانایەکی حەنەفی مەزهەب و خاوەنی (تەصانیف) و تەئالیفی زۆر بووە.**
**شارح باسی ئەوەشی کردووە کە خەطیب دووجار صحیحی بوخاری خوێندووە، ئەوە جارێکیان بووە، جارێکی دیکە لەلای** (كريمة المرْوَزية) **لە پێنج ڕۆژ لە ڕۆژانی حەجدا خوێندویەتی.**

**وە لە هەندێك (مەخطوطە) و دەستنوس لە کتێبخانەی نەجدیەی تایبەت لەوەی نیسبەت ئەدرێ بە (عبدالرحمن بن حسن آل الشيخ) خاوەنی کتێبی (فتح المجيد) ئەو گوتەیەیم بینیوە لە میانی دوو بەیتی شیعردا فەرمویەتی:**

شمّر الى طلب العلوم ذُيولاً        وانهض لذلك بكرة وأصيلاً
وَصِلِ السؤالَ وكُن هُديت مُباحثاَ        فالعيب عندي أن تكونَ جَهولاً

**شێخ عبدالرحمن بن حسن آل الشيخ لەو دوو بەیتەدا هانی (طالب العلم) ئەدا لەسەر جددیبوون و هەوڵدان و ئیجتهاد لە وەرگرتنی عیلمدا.**

**جا پیاوێك بە، قاچێکی لەسەر خاك (زەوی) جێگیر بێت و تەوقەسەری هیممەتی لە ژووری ئەستێرەی کۆوە بێت، وە بەدەن گەنجی هیممەت پیر مەبە، چوون هیممەتی طالبی ڕاستگۆ (لە تەڵەبی خواستراودا) پیر نابێت.**

**واتە: لەشت لە تەمەنی گەنجێتی نەبێ و هیممەتت لە حاڵی پیریدابێت و توانا و تاقەتت لە تەڵەبی عیلم نەبێ.**

أبو الوفاء ابن عَقيل **یەکێك لە زیرەکەکانی جیهان و یەکێك لە فوقەهای حەنابلە بووە، ئەم زانایە لە کاتێکا لە تەمەنی هەشتا ساڵیدا ئەبێ ئەم دوو بەیتە ئەچڕێ:**

ماشاب عزمي ولا حَزمي ولا خُلُقي        ولا وَلائي ولا ديني ولا كرمي
وإنما اعْتاضَ شَعْري غيرَ صِبغته        والشيبُ في الشَّعر غيرُ الشَّيب في الهِمم

ئەم زانایە لەمیانەی ئەم دوو بەیتە شیعرەدا پێمان ئەڵێت: هێشتا عەزم و حەزم و خوڕەوشت و وەلاو و دین و کەرەمی پیر نەبووە، بەڵکو مووەکەی ڕەنگی خۆی گۆڕیووە و لەشی لاواز بووە لە پیریدا ئەگینا هیچ شتێك لە هیممەتی نەگۆڕاوە.

شایەنی باسە ئەم زانایە کتێبێکی نووسیوە هەشت سەد (٨٠٠) بەرگ بووە، وە لەو تەمەنەشدا ساتێك لە تەمەنی زایە نەکردووە، وە حەریصیش بووە لەسەر عیلم پتر لەکاتێك کە تەمەنی بیست ساڵ بووە. بڕوانە: همسة في أذن شاب ص٤٣.

ئیبنولجەوزی فەرموویەتی: (العلم والعمل توأمان، أمُّهما علوُّ الهمة). عیلم و عەمەل، واتە: زانست و کردەوە دوانەن، دایکیان (ئەسڵیان) بەرزی هیممەتە. واتە: ئەگەر هیممەتی ئینسان بەرزبوو، دەگات بەوەی ئەیەوێ لە عیلم و عەمەل، چوون خاوەن هیممەتی بەرز بەسالاچوون ڕێگری ناکات لە گەیشتن بە مەقسود و ئەوەی ئەیەوێ.

ئیمامی بوخاری لە (کتاب العلم) لە صەحیحەکەیدا فەرموویەتی: (وتعلَّم أصحاب النبي ﷺ كباراً). واتە: یاوەرانی پێغەمبەر بە گەورەیی فێری زانست بوون. واتە: پیری و هەڵکشانی تەمەن ڕێگری نەئەکردن لە تەڵەبی عیلم و فێربوونی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ پێی هاتبوو لەلای خواوە جلّ جلالە، بەڵ هەر لە هەوڵدا بوون بۆ تەحصیلی عیلم و مەعریفەت.

## بنچینەی چوارەم
## بەختكردنی هیممەت لە عیلمدا بۆ عیلمی قورئان و سوننەت

بێگومـــان هـــەموو عیلمێكـــی ســـوودبەخش ئەگێڕدرێتـــەوە بـــۆ فەرمایـشتی خـوا و پێغەمبەرەكـەی ﷺ، واتـە: بـۆ عیلمـی قورئـان و سـوننەت، وە بـاقی علـوم و زانـستەكان یـان خزمـەتكاری ئـەوانن، جا ئەگەر خزمەتكاری فەرمایشتی خوا و فەرمایشتی پێغەمبەرەكەی بوون، ئەوەیان لێوەردەگیرێت خزمەتی پێوەدی بێت، ئەوانیش علومی ئالـەیان پێـدەگوترێ، چـوون ئـالات و ئـامرازی تێگەیـشتنیانن، واتــە: ئـەو عیلمانەن یارمەتی فـەهمكردن و تێگەیـشتنیان دەدەن وەك علـومی لوغـە و صەرف و نەحو، و باقی علومی عەرەبی و شەرعی.

یاخود علومی ئەجنەبی و بێگانەن پێیان و لـەوان نین، جا جـەهل پێیان و نەزانینیان زیانی نابێ.

پوختەی قسە: باقی علوم و زانستەكان لەم دوو حاڵە بەدەر نین.

جا عیلم و زانست هەمووی بۆ قورئان و سوننەت ئەگەڕێتەوە، وە خـــوا بـــەوەش فـــەرمانی بـــە پێغەمبـــەر ﷺ كـــردووە وەك ئـــەوەی فەرموویــەتی: ﴿فاستمـسك بالـذي أوحي إليـك انـك علـى صـراط مـستقيم﴾ (الزخرف: ٤٣).

**ئایا بە شتێکی دیکە جگە لە قورئان و سوننەت وەحیکراوە بۆ (أبو قاسم) ﷺ؟!**

**خوا جل جلالە لە ئایەتەکە دا فەرمانی دەستگرتنی بە وەحی قورئان و سوننەتەوە کردووە. وە ئەوەی عیلمی قورئان و سوننەتی تەحصیل کردبوو، ئەوە پەیڕەوکارە، واتە: غەیری ئەو کەسەیە بیدعەی لە ئاییندا داهێناوە، وە زۆرترین زانستیشی وەدەستهێناوە.**

**ئیبنومەسعود** رضي الله عنه **فەرمویەتی:** (من أراد العلم فليثوِّر القرآن، فإن فيه علمُ الأولين والآخرين)، **واتە: ئەوەی زانستی دەوێت با بۆ تێگەیشتنی لە قورئان و واتاکانیدا بۆی بگەڕێ، چوون زانستی پێشینەکان و پاشینەکانی تێدایە.**

**وە (مەسروق)[٦] یش فەرموویەتی:** (ما نسأل أصحابَ محمد عن شيء إلاّ علمُه في القرآن، إلاّ أنَّ علمنا يقصُر عنه)، **واتە: هیچ پرسیارێکمان لە یارانی (محمد) دروودی لەسەر بێت لەشتێکدا نەئەکرد ئیللا زانستەکەی لە قورئاندا هەبوو، ئەوە نەبێ زانستی ئێمە کورتی دەهێنا تێیدا.**

**ئیبن عەباس فەرموویەتی:**

جميعُ العلوم في القرآن لكن تقاصر عنه أفهامُ الرجال

---

**٦ مەسروق زانایەکی تابعی بووە لە ئەهلی کوفە.**

هـەموو زانـستەکان لـە قورئانـدان بـەڵام تێگەیـشتنەکانی خـەڵك کورتیان هێناوە تێیدا.

عیاض الیحصُبي لە کتێبی (الإلماع)دا چەندە جوان فەرموویەتی:

العلم في أصلين لا يعدوهمـا الاّ المضـلُّ عن طـريق اللاَّحبِ

علمُ الكتاب وعلم الآثـار التي قد أسندت عن تابع عن صأاحبِ

زانـست لـە دوو سەرچـاوەدایە و لێیـان لانـادات مەگـەر کەسـێکی گـومڕای لادەر نـەبێ لـە ڕێـی ڕوون، زانـستی کیتـاب و زانـستی ئاسـار (سوننەت) ئەوەیە لە تابعیەوە ئەویش لەڕێگەی هاوەڵێکەوە نیسبەت بە پێغەمبەر ئەدرێت یان بەرزئەکرێتەوە بۆ لای ئەو ﷺ.

وە بـەرزترین هیممـەت لـە تەڵـەبی عیلمـدا: ئیبنولقـەیم لـە کتـێبی (الفوائد)دا فەرموویەتی: تەڵەبی عیلمی کتـاب و سـوننەت و تێگەیـشتنی خـودی ئەوەیـە مەبەسـتە لـە خـوا و پێغەمبەرەکـەی و عیلمـی حـدود و سزاکاندا کە بۆ پێغەمبەری دابەزاندووە لە قورئاندا.

واتـە: ئـەوەی شـەرع ئەیـەوێ لـە بەنـدە لـە کیتـاب و سـوننەت و عیلمی (حدود) لەوەی خودا دایبەزاندووە لەوە و لە ئەحکامی دیکە.

وە ئەمـە عیلمـی سـەلەف بـووە ڕەحمـەتی خوایـان لەسـەر بێـت، پاشـان لـە دوای ئـەوان کـەلام و قـسە زۆر بـوو لـەوەدا کـە سـوودی نەئەگەیانـد، جا عـیلم لەسـەلەفدا زۆرتـر بـوو، کـەلام و قسەش لەوانـەی دوای ئەوان زۆرتر بوو.

**حەممادی کوڕی زەید فەرموویەتی:** (قلت: لأيّوب السَختَياني: العلمُ اليوم اكثرُ أوْ فيما تقدم؟ **زانست لەمرۆدا زۆرترە یاخود لە پێشودا؟ فەرمووی:** (الكلام اليوم اكثرُ، والعلمُ فيما تقدّم اكثر) **قسە ئەمڕۆکە زۆرترە، عیلمیش لەوەوبەر زۆرتر بوو.**

**واتە: عیلم و مەعریفە بە کیتاب و سوننەت لەسەردەمی صەحابە و کیباری تابعیندا زۆرتر بوو.**

**وە هەر لەبەر ئەوەش بووە ئەوان قسەیان کەم و بەرەکەتی زۆر بووە، وە قسەی پاشینەکانیش زۆر و بەرەکەتی کەم بووە وەك ئەوەی** (ابن أبي العز الحنفي) **لە** (شرح الطحايه)**دا فەرموویەتی، وە ئەمە دەقی وتەکەیەتی:**

(كان كلامُ المتأخرين كثيراً قليل البركة، بخلاف كلام المتقدمين فإنه قليلٌ كثيرُ البركة).

**هەڵبەت زۆرترینی زانستی سەلەف بە قورئان و سوننەت بۆ وابەستەبوونی دڵیان بە تەڵەبی تێگەیشتنی قورئان و سوننەت و لەباری مەقسودیان لە بڵاوکردنەوەی عیلم و نزیکی عەهدیان بە عەصری ریسالەتەوە بووە.**

**ئەمە زۆرترینی جیاوازییەکانی نێوان پێشینان و پاشینان بووە.**

**پرسیاریان کرد لە** (حمدون القَصَّار) **هۆی چی یە قسەی سەلەف سوودبەخشترە لە قسەی ئێمە؟! فەرمووی:** (لأنهم تكلّموا لعز الإسلام، ونجاة النفوس، ورضا الرحمن، ونحن نتكلّمُ لعزة النفس، وطلب الدنيا، ورضا

**الخلق). واتە: چوون ئەوان بۆ عیزەتی ئیسلام و ڕزگاربوونی نەفس و ڕەزامەندی ڕەحمان قسەیان ئەکرد و ئێمە بۆ عیزەتی نەفس و تەڵەبی دونیا و ڕەزامەندی خەڵك قسە ئەکەین.**

# بنچینەی پێنجەم
# وەبەرگرتنی ڕێگەی گەیەنەر بە زانست

بـۆ هـەموو خواسـتراوێك ڕێگەیـەك هەیـە ئەیگەیـەنێت پێـی.. جـا ئەوەی جـادەی خواسـتراوی وەبـەرگرت ڕایئـەگرێت لەسـەری، وە ئـەوەی لێی لابدات، زەفەر بە خواستراوەکەی نابات، واتـە: بەدەسـتی ناهێنێـت، وە عیلمیش ڕێگەیـەکی هەیـە ئـەوەی هەڵـەی بکـات گـومڕا دەبێـت و بـە مەقـسود ناگـات، وە پێدەچـێ کەسـێك سـوودی دەسـت کـەوێ لەگـەڵ ماندوو بوونێکی زۆردا.

زەڕنـوجی لـە کتـێبی (تعليم المعلم)دا دەفـەرموێ: (وكلُّ من أخطأ الطريق ضلَّ، ولا ينالُ المقصود قلَّ أو جَلَّ )، واتـە: هەرکەسـێك ڕێگـە هەڵـە بکات گومڕا دەبێت و بە مەقسود ناگات کەم بێت یاخود زۆر.

وە ئیبنولقـەیم لـە کتـێبی (الفوائد)دا ئەفـەرمووێ: (الجهلُ بالطريق، وآفتها، والمقصود يُوجب التّعب الكثير مع الفائدة لبقليلة)، واتـە: جـەهل بەڕێگـە و ئافاتـەکانی و بەمەقسود مانـدوو بونێکی زۆر ئیجاب دەکات لەگەڵ سودێکی کەمدا.

واتە: جەهل بەڕێگەی عیلم و بە ئافاتەکانی ڕێگەکە و بـە مەقسود لە تەڵەبی عیلم، فێرخواز زۆر ماندوو دەکات.

محمـــد مُرتـضى بـن محمـد الزَّبيـدي خـــاوەنی (تـاج العـروس) لـــە مەنزومەیەكیدا بەناوی (ألفيةُ السَّنَد) دەڵێت:

فما حَوى الغايةَ في ألفِ سنهْ　　　شخصٌ فخُذ من كلّ فن أحسنهْ

بحفــظ مـتنٍ جامعٍ للـراجح　　　تأخذهُ عـــلى مفيــد ناصـــحِ

هـیچ كەسێك نیـە ئـەوەی ئامانجییـەتی لـە هـەزار ساڵدا بەدەسـتی بهێنێت و پێی بگات، بۆیە تـۆ لـە هـەموو هونـەر و زانسـتێك باشـترەكەی وەرگـرە ئـەویش بـە دەرخكردنـی مـەتنێك ئـەبێ هـەموو ئـەوەی (راجـح)ە كـۆی كردبێتــەوە، وە ئــەبێ ئــەوەش لــەلای مامۆسـتایەكی ئــەوتۆوە وەربگری و بخوێنی ئەهل و شارەزا و دڵسۆز بێت.

جـا ڕێگـە و جـادەی عـیلم لەسـەر دوو شـت دامـەزراوە، ئـەوەی هــەردووكیان بگرێــت ئــەوە زانــستی بەگــەورە ڕاگرتــووە، چــون لــەو شوێنەوە تەڵەبی دەكات مومكین و گونجاو بێت:

ئەمما یەكەم شت: دەرخكردن و لەبەركردنی مەتنێكی (جامع)ە بۆ ئـەوەی (راجـح)ە و مەتنەكـە ئیعتمـادی لەسـەر كـردووە، هـەڵهاتن لـە دەرخكـردن نییـە، ئـەوەی گومـانی وابێـت كـە بـە زانـست دەگـات بـەبێ دەرخكردن ئەوە تەڵەبی شتێكی نەگونجا و موستەحیلی كردووە.

وە ئـەوەی ئیعتمـادی لەسـەر ئـەكرێ لـە دەرخكـراو ئـەو مەتنەیـە (جامع) بێت بۆ (راجح)، واتـە: بـۆ ئـەوەی ئیعتمـاد لەسـەر كـراوە لـەلای ئەهل و خاوەنی ئەو هونەرو زانستە، جا فێرخـواز سـوود لـەوە نابینێـت ئەگـەر بێـت و مـەتنێكی نادیـار لـە هونـەر و زانسـتێكدا دەرخ بكـات و

مـەتنێكی مەشـهور تـەرك بكـات، وەك ئـەوەی (ألفية الآثاري) لـە (نَحْو)دا لەبەر بكات و واز لە (ألفية ابن مالك) بهێنێت.

وە ئەمما دووەم شت: ئـەبێ وەرگـرتن و خوێـندنی مەتنەكە لـەلای مامۆستایەكی شارەزای دڵسۆز بێت، جا هانا بەرێت بۆ مامۆستایەك واتاكانی مەتنەكە تێبگات، وە وەسفدار بێت بەم دوو وەصفە:

یەكـەمیان: ئیفـادە، ئـەویش ئەهلیەتـە لـە عیلمـدا، جا لەوانـەبێ بەتەڵـەبی عـیلم و وەرگـرتنی ناسـرابێ هـەتا پێگەیـشتووە، جـا عیلمەكەشی بۆی بووبێت بە مەلەكەیەكی بەهێز تێیدا، وە ئەسڵ لەمـەدا ئـەو فەرمودەیەیـە ئـەبوداود لـە سـونەنەكەیدا بەسـەنەدی خـۆی لـە پێغەمبـەری خـواوە ﷺ ڕیوایـەتی كـردووە، وە ئەمـە دەقەكەیـەتی: (تسمعون، ويُسْمَعُ منكم، ويُسْمَعُ ممن يَسْمَع منكم) وإسناده قويّ.

واتە: ئێوە عیلم لە منەوە ئەبیستن، پاشـان ئەوانـەی دوای خۆتـان لە ئێوەی ئەبیستن، وە هەر بەوشێوەیە ئەوانیش یەك لەیەكی ئەبیستن.

وە عیبرەت بە عموم و گشتگیری خیتابەكەیە نـەك بـە خـصوص و تایبەتمەنـدی موخاتەبەكـە، جا بـەردەوام لـە مـەعالیم و ڕێنماییـەكانی عـیلم لـەم ئوممەتـەدا ئـەوە بـووە كـە ئـەوەی پاشـین لـەوەی پێـشینی وەربگرێت و ببیستێت.

ئــەمما وەصــفی دووەم: نەصــیحەتە، وە ئــەویش دوو واتــا كۆدەكاتەوە:

**یەکـــەمیان: صـــەلاحیەتی مامۆســـتاکە بـــۆ ئیقتیـــداپێکردن و پـەیڕەویلێکردنی و دۆزینـەوەی ڕێگـەی ڕاسـت و وەبـەرگرتنی بـەهۆی ڕێباز و ڕێڕوونی و سەنگینی و ڕەفتاریەوە.**

**دووەمیـان: زانـینی ڕێگـەکانی فێرکـردن، بەشـێوەیەك فێرکردنـی فێرخواز جوان بزانێت، وە بزانێت چی بۆی ئەگونجێت و باشە و چی زەرەر و زیـانی پێدەگەیـەنێت بـە وەفـق و گـوێرەی پـەروەردەکردنی زانستی ئەوەی ئیمامی** (شاطبي) **لە** (الموافقات)**دا باسی کردووە** [٧].

٧ ئیمامی شاطبی دوو ڕێگەی بۆ فێربوونی زانست تێدا باس کردووە:

یەکەمیان: موشافەهەو وەرگرتنی عیلم لە دەم و زاری مامۆستاوە.

دووەمیان: موتالاو خوێندنەوەی کوتوبی زانایان.

# بنچینەی شەشەم
## ڕەچاوکردنی هونەرەکان لە وەرگرتنی و پێشخستنی گرنگتر بەسەر گرنگدا

بێگومان وێنەی جوان بە چێژ وەرگرتنیان بینایی لە هەموو بەشەکانی جوانیەکەی زیاد ئەکات، وە بە ئەندازەی ئەوەی بەر لە بینینی هەندێك لە بەشەکان بگرێت لە جوانیەکەی لەدەست ئەدا لەلای بینەر، وە زانستیش وایە، ئەوەی ریعایەتی هونەرەکانی بکات بە وەرگرتن و لە هەموو هونەرێکیش بەشی خۆی بەرێت، ئەوکات ئالەت و ئامرازەکەی لە عیلمدا کامڵ ئەبێت، چوون کەماڵی ئالەت لە عیلمدا بەوە ئەبێ کە فێرخواز بەشێك لە هەموو ئەوەی تەعەللوق و پەیوەندی بە عیلمەوە هەیە وەربگرێت.

ئیبنولجەوزی لە (صيد الخاطر)دا فەرموویەتی: (جمعُ العلوم ممدوح)، واتە: کۆکردنەوەی زانستەکان ستایشکراوە. وە (ئیبنولوەردی)یش هەر لەوەدا فەرمویەتی:

من كل فن خُذ ولا تجهلْ به     فالحُرُّ مطَّلِع على الأسرار

ئەویش لەو بەیتەدا ڕێنمایی فێرخواز ئەکات بۆ ئەوەی لە هەموو هونەرێك (زانستێك) وەرگرێت و بخوێنێت..هتد.

**پاشان دوو وەسیەتی گەورە لە وەسیەتەکانی عەللامە محمد بن مانع رحمه الله باس ئەکات، ئەڵێت:**

**وە مامۆستای مامۆستاکانمان محمد بن مانع لە** (ارشاد الطلاب)**دا دەفەرموێ:** (ولا ينبغي للفاضل أن يترُك علماً من العلومِ النافعة التي تُعينُ على فهم الكتاب والسنة، اذا كان يَعلَمُ من نفسه قوةً على تعلُمهِ، ولايسوغُ له أن يعيبَ العلم الذي يجهلُهُ ويُزْريَ بعالمهِ، فإنَّ هذا نقص ورذيلةٌ، فالعاقلُ ينبغي له أن يتكلّم بعلم أو يَسكُتَ بحلْم والاّ دخلَ تحت قول القائل:

أتاني أَنَّ سَهْلاً ذَمَّ جهلاً　　علوماً ليس يَعرفهُنَّ سهلُ

علوماً لَو قرأها ما قلاها　　ولكنَّ الرضا بالجهل سهلُ

**قسەکەی کۆتای هات.**

**واتە: ناشێت بۆ خاوەن فەزڵ واز لە زانستێك لەو زانستگەلە سوودبەخشە بهێنێت کە یارمەتی دەدات بۆ تێگەیشتن لە کیتاب و سوننەت بە مەرجێك لە خۆی ڕاببینێ هێزی بەسەر فێربوونیدا بشکێت، وەبۆی ڕەوانیە ئەو عیلمەی نایزانێت عەیبداری بکا و قەشمەری بە خاوەنەکەشی بکات، چوون ئەوە کەموکورتی و ڕەزیلەیە، جا بۆ عاقڵ وا جوانە گفت بە عیلم بکات و بدوێت یاخود بە حیلم سکوت بکات و بێدەنگبێت، وە ئیللا داخڵی ژێر وتەی شاعیر دەبێت کە لە (سەهل) ناوێکدا فەرموویەتی کە ئەمە واتاکەیەتی:**

پێمگەیشت کە سەهل لە جەهلەوە زەمی زانستگەلێکی کردووە کە خۆی نایانزانیٚ، ئەگەر بیخوێندبانایە نەیئەبوغزاندن، بەلاٚم قایلبوون بە جەهل ئاسانە، وە هەر لەبەر ئەوە زانستەکانی بوغزاندووە.

پاشان باسی ڕەچاوکردنی هونەرەکانی زانستی کردووە و وتویەتی:

بێگومان ڕەچاوکردنی هونەرەکانی زانست بە ئیعتماد لەسەر دوو بنەما سودی بۆ فێرخواز ئەبێت ئەوانیش:

یەکەمیان: پێشخستنی گرنگتر بەسەر گرنگدا لەوەی فێرخواز لە هەستان بە ئەرکەکانی (عبودییەت) و پەرستشەکانی بۆ خوا پێویستی پێدەبێت، چوون مەبەست لە فێربوونی زانست لەڕووی دیانەت و دینداریەوە ئەوەی زۆرتر پێویستت پێیەتی ئەوە پێش بخە، واتە: گرنگترین پێش بخە بەسەر گرنگتردا و گرنگتریش پێشبخە بەسەر گرنگدا، هەر لەبەرئەوە خوێندنی عەقیدە و فێربوونی نوێژ و مەرجەکانی و ئەحکام و چۆنیەتیەکەی، یاخود دەست نوێژ و مەرجەکانی و ئەحکام و چۆنیەتیەکەی، یاخود (ئاداب) و (أذكار) و فێربوونی قوڕئان و تەجوید و قیرائەتێك لە قیرائەتەکان بەجوانی و دروستی لە دوای فێربوونی نوسین و خوێندنەوە پێش دەخرێت بەسەر عیلمی ئوصول یاخود نەحو، یاخود صەرف، یاخود قەواعیدی فقهیدا، ئەمە بە نیسبەتی موبتەدی و فێرخوازێکەوە کە لە قۆناغی سەرەتایدا بێت.

وە دواتــر وتەیــەکی ئیمــامی مــالیکی باســکردووە و وتویــەتی: پرسیان لە مالیکی کوڕی ئەنەس ئیمامی دارولهجرە دەربارەی تەڵـەبی عـیلم کـرد، ئـەویش فـەرمووی: (حسن جميل، ولكن انظر الذي يلزمُك من حينِ تُصبحُ الى حينِ تمسي فالزمْهُ)، واتـە: چاکە جوانـە، بـەڵام سـەیر بکـە ئەوەی پێویستت دەبێ لە کاتێکەوە ڕۆژ دەکەیتەوە هـەتا کاتێك ئێـوارە دەکەیتەوە لازمی بە، واتە: تەڵەبی ئەوە بکە لە پێشدا.

وە (ابو عبيدة مَعْمَر بن المثنى) ئەویش لەو بارەیەوە فەرمویەتی: (مَن شغل نفسه بغير المهم أضرَّ بالمهم)، واتـە: ئـەوەی خـۆی خـەریك کردبێ بـە غەیرەز گرنگەوە، زیانی بە گرنگ گەیاندووە.

وقدّم الأهم إن العلم جمٌّ والعمرُ طيفٌ زارَ أو ضيفٌ ألَمٌّ

واتە: گرنگرترین پێش بخە چوون عـیلم زۆرە و تەمـەنیش خـەیاڵ و خەونێکە سەری لێداوە یاخود میوانێکە لەلای دابەزیوە.

بنـەمای دووەم: ئـەبێ لـە سـەرەتای تەڵـەبی عیلمـدا قەصـدی ئـەوە بێـت تەحـصیلی (موختەصـەر)ێك بکـات لـە هـەموو هونـەرێکی زانستدا هەتا کاتێك جۆرەکانی زانستە سوودبەخشەکان تەکمیل دەکات، پاشـان کاتێك جۆرەکانی زانستەکانی تەکمیل کرد سەیر بکات کامـەیان لەگـەڵ سروشـتیدا دەگونجێـت و لـە نەفـسی خـۆی ڕائـەبینێ توانـای بەسـەردا ببێت با تێیـدا قووڵ بێتـەوە، ئیدی فەن و زانستێك بێ یـاخود زۆرتـر. پاشـان وتویـەتی: ئـەمما گەیـشتن بـەو پـەڕ و دوایـی هـەموو فـەن و زانستێك و تەحەقوق بە مەلەکە و ئامادەیی زیهنی یاخود ویژدانی هەتا

بنج دائەکوتێت لە نەفسدا، هەتا یەك لە دوای یەك لـە ماوەیـەکی درێـژدا بـۆی ئەسـازێ. پاشـان فێرخـواز سـەیربکات چـی بـۆ ئـەگونجێت لـە تەحـصیلی علـوم بــە تــاك تــاك خوێنــدنی هونــەرەکانی زانــست و موختەصەرەکانی یەك لە دوای یەك، یاخود بە کۆکردنەوەیان پێکەوە، بەڵام خوێندنیان بە تاك تاك بۆ عمومی تەڵەبە موناسیب و گونجاو ترە لە کۆکردنەوەیان پێکەوە.

پاشـان دوو بـەیتی لـە ڕێنمـایی و ئیرشـاد بـۆ ئـەوە باسـکردووە و وتویەتی:

شاعیرێکی شنقیطی ئەڵێت:

| | |
|---|---|
| وإن تُــــرد تحصيلَ فنّ تَمِّمُهْ | وعن سـواه قبل الإِنتهاء مَه |
| وفي ترادُفِ العلومِ المَنعُ جا | إن توأمان استبقا لن يَخرُجا |

واتە: ئەگەر ویستت زانستێك تەحصیلێ بکەیت تەواوی بکە و بەر لە تەواوکردنی واز لە هی دیکە بهێنە و مەچۆ ناویـەوە هـەتا ئـەو تـەواو دەکەیت، چوون لە تەرادوف و کۆکردنەوە لـە نێـوان دوو عیلمـدا یـاخود زۆرتر بەوەی یەکێکیان بەدوای ئەوی دیکەدا بێ نـابێ بێـت چوون وەك دووانە وانە، ئەگەر دووانەیەك پێشبڕکێ بکەن پێکەوە بێن، ئەوە نایەنـە دەرەوە.

شـاعیر کۆکردنـەوەی دوو عیلمـی لەیـەك کاتـدا چوواندوە بـە دوو منداڵی دوانەوە کە لە سکی دایکیاندا پێکەوە بێنەدەرەوە، جا ئەگەر لـە دەرگـای منداڵدانـدا ئیزدحامیـان دروسـت کـرد و پێکـەوە ئـەهاتن ئـەوە

لەدایکبوونیان گرانە، بە پێچەوانەی ئەوەی یەکێکیان هاتبێت و پاشان دووەمەکەشیان بێت، جا وەرگرتنی عیلمیش هەروایە، بۆیە دەبێ یەکێکیان تەواو بکرێ پاشان بگوێزرێتەوە بۆ یەکێکی دیکە.

هەڵبەت ئەمە مانیع نیە لەوەی کەسێك توانای کۆکردنەوەی هەبێ لە نێوان دوو عیلم یاخوود زۆرتردا وەك ئەوەی باسی کردوە ووتویەتی: وە ئەوەی لەخۆی ڕائەبینی و ئەیزانی توانای جەمعی هەیە، ئەوە جەمع بکات، وە حاڵی ئەو کەسە جیایە لە عموم و حاڵی تەڵەبەی عیلم بە گشتی.

شێخ سێ (ناقض) و هەڵوەشێنەری لە (نواقض) و هەڵوەشێنەرەکانی ئەم بنچینەیە باس کردوە و فەرمویەتی: وە لە هەڵوەشێنەرە بینراوەکانی ئەم بنچینەیە: خۆ مەنعکردنە لە جۆرەکانی زانستەکان و سوکایەتی کردنە بە هەندێك لە مەعاریف و خۆ خەریککردنە بەوەی سود نابەخشێت لەگەڵ خۆ بەستنەوە بە ئەوەی غەریب و نامۆیە لە عیلم، وە مالیك فەرمویەتی: (شرُّ العلم الغريب، وخيرُ العلم الظاهر الذي قد رواه الناس).

واتە: خراپترین زانست ئەوەیە غەریبە لەناو خەڵکدا، وە باشترینی ئەوە زاهیر و دیارە و خەڵك دەم بە دەم گێراویانەتەوە.

ئیمامی سیوطی رحمه الله لە یەکێك لە کتێبەکانیدا باسی ئەوەی کردوە و فەرمویەتی: زۆرێك لە خەڵك دەربارەی ئاوی تۆفانەکەی نوح

پرسـیاریان لێـدەکردم ئایـا شـیرین بـووە یـاخود سـوێر... هتـد. ئـەوەی باسی کردووە نمونەیەکە لە غەریبـی عیلم.

هەڵبـەت خۆخـەریکردن بـە غـەریبی عیلمـەوە کـات کوشـتنە بـەبێ هـودە، وە حەیفـە ئینـسان خـۆی پێیـەوە خـەریك بکـات، چـوون عـومر کورتــە و عیلمــیش زۆرە و عــاقڵیش کەســێکە خــۆی بــە زانــستی بەسوودەوە خەریك بکات.

## بنچینەی حەوتەم
## موبادەرە و پەلەکردن بۆ تەحصیلی عیلم و قۆستنەوەی تەمەنی منداڵی و گەنجێتی

بێگومان تەمەن گوڵێکە: یان بە چوونە ناو (مەعالی) و پلە باڵاکان ئەبێت بە بەر و میوە، یان ئەپوکێتەوە و تەڕایەتی دەڕوا، وە بێگومان لەوەی گوڵی تەمەن بەهۆیەوە بەر و سەمەر ئەدا: موبادەرە و پەلەکردنە بۆ تەحصیلی عیلم و وازهێنانە لە تەمبەڵی و دەستەپاچەیی و بە هەلزانین و قۆستنەوەی تەمەنی منداڵی و گەنجێتی یە، بە فەرمانبەرداری بۆ پەلەکردن لە خێراتدا وەك ئەوەی خوای باڵادەست فەرمویەتی: ﴿فاستبقوا الخيرات﴾ (البقرة: ١٤٨).

شاعیر وتویەتی:

وأيامَ الحداثة فاغتنمها ألا إنَّ الحداثة لاتدومُ

واتە: ڕۆژانی تەمەنی گەنجێتی بقۆزەوە، بێداربە کە ئەوە زۆر ناخایەنێت و زوو تەواو ئەبێت.

ئیمام ئەحمەدیش فەرموویەتی: (ما شبَّهتُ الشباب الا بشيء كان في كُمي فسقط)، واتە: تەمەن و قۆناغی گەنجێتیم چواندوە بە شتێکەوە

لـەناو لـەپی دەسـتمدا بووبێـت بـەر بووبێتـەوە و کەوتبێتـە خـوارەوە، مەبەستی ئەوەیە گەنجێتی خێرا تەواو دەبێت و دەڕوات.

**پاشـان فەرمویـەتی:** (والعلمُ في سن الشباب أسرعُ الى النفس، وأقوى تعلُّقاً ولُصوقاً)، واتـە: زانـست لـە تەمـەنی گەنجێتیدا خێراتـرە بۆ نەفسی ئینـسان و زووتـر وەریـدەگرێت و پێوەنـدی و پێوەنووسـانی بـەهێزترە، جا ئەوەی پەلە بکات بۆ تەڵـەبی عیلم لـە تەمـەنی گەنجێتیـدا، ئـەوا ئـەو زانستە بەهێزتر و جێگیرتر ئەبێ لە نەفس و دڵی دا.

**حەسـەنی بەصـری فەرموویـەتی:** (العلـمُ فـي الـصِّغَر كـالنقش فـي الحجر)، واتـە زانـست لـە تەمـەنی منداڵیـدا وەك نەخشە لـە بـەرددا. جا هێـزی مانـەوەی عـیلم لـە تەمـەنی منـداڵی و گەنجێتیـدا وەك هێـزی مانـەوەی نـەخش وایـە لـە بـەرددا، کەواتـە ئـەوەی ئـەوەڵی تەمـەن و گەنجێتی قۆستبووەوە ئەوە پێویستی خۆی دەست کەوتووە و لـەکاتی پیریـدا شـەونخوینەکەی ستایـشی دەکـات. شـاعیریش لـەو بارەیـەوە وتویەتی:

ألا اغتنم سن الشباب يافتى      عند المشيب يَحمدُ القومِ السُّرى

دەسـا ئـەی گـەنج تەمـەنی گـەنجیت بقـۆزەوە، خـەڵك لـە پیریـدا ستایشی شەو نخونییەکان دەکات.

زیانبەخـشترین شـتێك لەسـەر گـەنجان دواخـستنی خوێنـدن و تەڵـەبی عـیلم و زانـست و دوور و درێـژی هیـوا و ئومێـدە، ئـەبینی یـەکێکیان خوێندنەکـەی دوا ئـەخات و سـواری کەشـتی هیواکـان و

ئاواتەکانی ئەبێت و بە خەونەکانی بێدارییەوە[8] خەریك ئەبێت و لەبەرخۆیەوە و لە دڵ و دەروونی خۆیدا ئەڵێت لە ڕۆژانی ئایندەدا دەستی لە هەموو ئەو شتانەی خەریکییان کردووە بەتاڵ دەبێت و لە بەربەستەکان و ئاستەنگەکان ڕزگاری دەبێ.

وە حاڵی بینراو لە واقیعی خەڵکدا ئەوەیە کە ئەوەی تەمەنی هەڵکشابێت سەری قاڵتر بووەو دابڕانیشی زۆرتر و گەورەتر بووە لەگەڵ لاوازی لاشەو سستی هێزدا. فێرخواز بە خەفەتخواردن و ئاواتخواستن ناگات بە ئامانجگەلە گەورەکان.

ولستُ بمُدركٍ مافات مني بـ(لَهْفَ) ولا بـ(ليت) ولا (لوأنّي)

واتە: بەخەم و خۆزگە و بە ئاواتخواستن ناگەم بەوەی لەدەستم چووە.

وە واگومان نەبرێ لەوەی لە پێشدا ڕابرد کە ئینسانی بەتەمەن و گەورە فێر نابێ، بەڵکو هەندێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بەتەمەن و گەورەش بوون فێربوون وەك ئەوەی بوخاری لە (كتاب العلم) لە صەحیحەکەیدا باسی کردووە، بەڵام ئەوە هەیە فێربوون لە تەمەنی هەڵکشاو (پیری)دا سەختە - وەك ئەوەی ئەلماوەردی لە کتێبی (أدب الدنيا والدين)دا ڕوونی کردووەتەوە - ئەویش لەبەر زۆری شوغڵگەرەکان و زاڵبوونی پەیوەندبڕەکان بە عیلمەوە و زۆربوونی پەیوەندیە

---

٨ خەونەکانی بێداری (أحلام اليقظة) تەرکیبێکە مەبەست پێی شتێکە حەقیقەتی نەبێ.

کۆمەڵایەتییەکان، جا ئەوەی توانی دەفعیان بکات لە خۆی، ئەوە ئەگونجێت تەڵەبی عیلم بکات و پێشی بگات.

وە لە کۆن و تازەدا ئەوەی بە گەورەیی تەڵەبی عیلمی کردبێت، ئەوە وایلێهاتووە بە پێشکەوتن (تقدُّم) تێیدا ئاماژەی بۆ بکرێ.

وە بەدڵنیاییەوە ئەمە بۆ کۆمەڵێك لە بوزورگان ڕەخساوە کە هەر بە گەورەیی تەڵەبی عیلمیان کردوە، و قەدر و ئەندازەیەکی زۆر و گەورە لە عیلم فێربوون و پێی گەیشتوون، و لەناویاندا زانای ناودار (قَفّال الشافعي) ڕەحمەتی خوایان لێبێت یەکێك بووە لەوانەی بە گەورەیی تەڵەبی عیلمی کردووە.

## بنچینەی هەشتەم

## وابەستە بوونی شێنەیی لە تەڵەبی عیلمداو پەلە نەکردن تێیدا

بێگومان عیلم بە یەکجارەکی تەحصیل نابێ، چوون دڵ توانای ئەوەی نابێ، بەڵ بێهێز ئەبێ لەوەی بەیەکجارەکی تەحصیلی بکات، چوون عیلم قورساییەکی تێدایە وەك قورسایی بەرد لە دەستی هەڵگرەکەیدا، خوای بالاّ فەرموویەتی: ﴿انا سنلقي عليك قولاً ثقيلا﴾ (المزمل: ٥)، وە کاتێك ئەمە وەصفی قورئانی ئاسانکراو بێت وەك ئەوەی خوا فەرموویەتی: ﴿ولقد يسَّرنا القرآن للذكر﴾ (القمر: ٤-٢٢-٣٢-٤٠)، ئەبێ گومان بە غەیری قورئان لە زانستەکان چی بێت؟!

وە بێگومان دابەزاندی قورئان بەڕەچاوکردنی بۆ ئەم کارە لە وەخت و ساتی جیاجیادا بووە بە ئیعتباری ڕووداوەکان وەك ئەوەی خوای بالاّ فەرمویەتی: ﴿وقال الذين كفروا لولا نزّل عليه جملةً واحدة كذلك لنثبت به فؤادكَ ورتلناه ترتيلا﴾(الفرقان: ٣٢).

ئەم ئایەتە بەڵگەیە لە پابەندبوونی شێنەیی لە تەڵەبی علیم و پلەبەندی تێیدا و تەرکی پەلەپەل وەك ئەوەی خەطیبی بەغدادی لە (الفقه والمتفقه) و راغبی ئەصفەهانی لە پێشەکی (جامع التفسير)دا باسیان

**کردووە، پاشان شێخ دوو بەیتی** (ابن النَّحّاس الحلَبي) **باسکردووە کە لەهەمان واتادا وتویەتی:**

| | |
|---|---|
| اليوم شيئٌ وغَداً مثلُهُ | من نُخَب العلم التي تُلتقَط |
| يُحَصِلُ المرء بها حكمةً | وإنما السبيلُ اجتماعُ النُقطْ |

**شوعبەی کوڕی حەجاج فەرمویەتی:** (التفتُ الى عمرو بن دينار خمسمائة مرة، وما سمعتُ منه إلا مائة حديث، في كل خمسة مجالس حديث)، **واتە: پێنج سەد جار هاتوچۆی عەمری کوڕی دینارم کرد، تەنها سەد حەدیسم لێ بیست، ئەویش لە هەموو پێنج مەجلسێکدا حەدیسێك.**

**حەممادی کوڕی ئەبو سولەیمان بە قوتابیەکەی دەفەرموێت:**

(تعلّمْ كلَّ يوم ثلاثَ مسائلَ، ولا تزدْ عليها شيئا)، **واتە: هەموو ڕۆژێك سێ مەسەلە فێر ببە و هیچ شتێك لەسەریان زیاد مەکە. موقتەزای لازمبونی شێنەیی و پلەبەندی: دەستکردنە بە لەبەرکردن و ڕاڤەکردنی ئەو مەتنە کورت کورتەی لە هونەرەکانی عیلمدا پۆلێنکراوە، وە لادانە لە موتاڵەعە و خوێندنی** (مطوّلات)، **ئەوانەی** (طالب العلم) **لە دواییشدا پێیان ناگات.**

**جا ئەوەی ئەیەوێ بە شێنەیی و لەسەرخۆ تەڵەبی عیلم بکات، دەبێ پابەندبێ بەم دوو بنەمایەوە، وە ئەوەشی تەعەروز بکات بۆ سەیرکردنی** (مطوّلات)**، ئەوە بێگومان تاوانی کردووە دژ بە ئایینەکەی، وە تەجاوز لە ئیعتدال لە زانستدا لەوانەیە ببێتە هۆی ئەوەی زایەی بکات.**

پاشان شێخ وتەیەکی شێخ عبدالكريم الرِّفاعي یەکێك لە شیوخی عیلم لە دیمەشقی شام لە سەدەی ڕابردوودا باس کردووە ئەویش ئەوەیە کە ئەفەرموێ: (طعامُ الكِبار سُمُّ الصِّغار)، واتە: خواردنی گەورەکان ژەهری بچوکەکانە.

ئەمە بەواتای ئەوەیە ئەگەر وا دابنێین گۆشت بدرێ بە منداڵی ساوا و شیرەخۆر تەندروستی تێك ئەدا و لەوانەشە بیکوژێ، جا ئەوەی لەسەرەتاوە دەست بە خوێندنی (مطولات) بکات ئەویش هەروایە و لەوانەیە زیان بە خۆی بگەیەنێت، نەك بە واتای ئەوەی سەرەتاخوێنان بۆیان نەبێ لە دانیشتنگەلە زانستییەکانی زانایانی کیبار و گەورەدا بەشدار بن.

ڕاڤەکار لەسەر وتەکەی شێخ عبدالكريم الرفاعی وتویەتی: ئەم وشەیە بە دوو واتا دێت:

یەکەمیان: ڕەچاوکردنی پلەبەندی (تدرج) لە عیلمدا، وە ئەمەیان دروستە.

دووەمیان: وەرنەگرتنی عیلم لە گەورە زانایان لە ڕووی عیلم و تەمەنەوە، وە ئەم واتایە (فاسد) و پووچە.

وە لە کۆتایی ئەم بنچینەیەدا شێخ وتوویەتی: عبدالكريم الرفاعی ڕاستی گوتووە، چوون منداڵی ساوا و شیرەخۆر کاتێك لە خواردنی گەورەکان بخوات -هەرچەندە پاك و بەتامیش بێت- بەهیلاکی دا ئەبات و لە پەلوپۆی ئەخات، وە ئەوەشی مەسەلەگەلی گەورە لە

(مطـوّلات)دا وەردەگرێــت و نەفسیــشی لەگــەڵ لاوازی ئـامراز لەســەر جیـاوازی زانایـان و فرەیـی مەزهەبـەکانیان لـە مـەنقول و مـەعقول دا ڕادەگرێــت هاوشــێوەی ئەوەیــە، واتــە: هاوشــێوەی منداڵــە ســاوا و شیرەخۆرەکەیە کە خواردنی گەورە بخوات..

## بنچینەی نۆیەم
## صەبر و ئارامگرتن لە وەرگرتن و ئەداکردنی عیلمدا

فێرخواز پێویستی بە صەبر و ئارامگرتن هەیە لە وەرگرتن و کۆکردنەوەی عیلمدا، پاشان لە ئەداکردن و بڵاوکردنەوەیدا، چوون هەموو شتێکی گەورە مرۆڤ پێی ناگات ئیللا بە صەبر و ئارامگرتن نەبێ، وە گەورەترین شتێك پێویست بێت نەفس تەحەمولی بکات تەڵەبی (مەعالی)ە واتە: عیزەت و شەرەف و رەفعەت و بڵندییە، وەلەبەر ئەمە لە ئایەتگەلێکی زۆردا فەرمانکراوە بە (صەبر) و (مُصابەرە)[9]، جارێك بۆ تەحصیلی ئەصلی ئیمان و جارێکی دیکە بۆ تەحصیلی کەماڵی ئیمان، خوای باڵا فەرمویەتی: ﴿یاأیها الذین آمنوا اصبروا وصابروا﴾ (آل عمران: ٢٠٠)، وە فەرمویەتی: ﴿واصبر نفسك مع الذين يدعون ربهم بالغداة والعشي يريدون وجهه﴾ (الكهف: ٢٨).

ڕاڤەکاری قورئان (يحيي بنُ أبي كثير) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا فەرمویەتی: (هي مجالس الفقه)، واتە: حەبسی نەفست بکە لەسەر (مجالس) و دانیشتنەکانی (فقه)... هتد.

٩ مُصابرة لەسەر کێشی (مُفاعَلَة)یە ئەویش لە نێوان لە نێوان دوو کۆمەڵدایە و بۆ موشارەکەیە.

وە هیچ کەسێك ناتوانێ تەحصیلی عیلم بکات ئیللا بە صەبرو حەبسکردنی نەفس نەبێ لەسەری، واتە: عیلم حاصڵ نابێ ئیللا بە صەبرو حەبس کردنی نەفس نەبێ.

وە دیسان (یحیي بن أبي کثیر) فەرمویەتی: (لایُستطاعُ العلمُ براحة الجسم)، واتە: ناتوانرێ عیلم تەحصیل بکرێ بە ڕاحەتی جەستە.

وە شێخ دووشتی لە مەنفەعەت و سوودی صەبر لە عیلمدا باسکردووە و فەرموویەتی: بەصەبر لەسەر عیلم ئینسان لە نەنگی جەهل دەردەچێت. ئەمە یەکەم.

ئەلئەصمەعی فەرمویەتی: (مَن لم یحتمل ذُلَّ التعلیم ساعةً، بقي في ذُلَ الجهل)، واتە: ئەوەی نەتوانێت لەسەر زیللەتی عیلم ساتێك ئارام بگرێ، ئەوە لە زیللەتی نەزانیدا ئەمێنێتەوە.

دووەم: وە هەر بە صەبریش هەست بە تام و چێژی عیلم دەکرێ.

هەندێك لە سەلەف فەرمویەتی: (من لم یحتمِلْ ألَمَ التعلیم، لم یُذق لذة العلم)، واتە: ئەوەی ئازاری فێربوونی عیلم هەڵنەگرێ، تام و چێژی عیلم ناکات.

وە هەنگوینی ناو شانە بەدەست نایەت بەبێ پێوەدانی هەنگ نەبێ، وە مەعالی کار و باریش هەروایە بەئاسانی و بەبێ زەحمەت بەدەست نایەت.

جاران ئەیانوت: (ومن لم یرکب المصاعب، لم ینل الرغائب)، واتە: ئەوەی ناڕەحەتیەکان تێنەپەڕێنێت بە خواستەکان ناگات.

پاشان باسی صەبری زانستی کردووە و فەرمویەتی: صەبری زانست دوو جۆرە:

یەکێکیان: صەبرە لە تەحەممول و وەرگرتنیدا، جا هەریەکە لە لەبەرکردن و تێگەیشتن و حزوری دانیشتنەکان و مەجالیسی عیلم و ڕەچاوی مافی مامۆستا پێویستی بە صەبر هەیە..

جۆری دووەم: صەبر لە ئەداکردنی و بڵاوکردنەوەی و گەیاندنی بە ئەهلی خۆی، جا دانیشتن بۆ فێرکردنی فێرخوازان و تێگەیاندنیان و ئیحتمال و قەبوڵکردنی زەللات و هەڵەکانیان پێویستی بە صەبر هەیە.

وە لەسەرووی ئەم دوو جۆرە لە صەبر لە زانستدا صەبرە لەسەر صەبر تێیاندا و سەباتە لەسەریان. واتە: صەبر و سەبات لەسەر ئەو دوو جۆرە لە صەبر.

لكل إلى شأوِ العُلا وَثَباتُ ولكن عزيزٌ في الرجال ثَباتُ

واتە: بۆ هەموو کەسێك بەرەو غایە و ئامانجی بەرز بازگەلێك هەیە لەتەڵەبکردنیاندا، بەڵام سەبات لە پیاواندا کەمە.

پاشان ووتویەتی: وە ئەوەی پابەندی صەبر بێت خێر و چاکە بەدەست دەهێنێت.

شێخ دوو بەیتی أبو يَعلى المَوصِلي فەرمودەناسیشی باسکردووە و وتویەتی:

ئەبویەعلای موسڵی فەرمودەناس فەرمویەتی:

إني رأيتُ وفي الأيام تَجربةٌ للصـــبر عــاقبةٌ محمــودة الأَثر

وقلَّ مَن جَدَّ في أمرٍ تَطلبُهُ          واستصحبَ الصبرَ إلاّ فاز بالظَّفر

**واتە: لە ڕۆژانی ڕابردوودا ئەزموونی پاشەڕۆژی سەبرم بینیوە شوێنەوارێکی باشی بووە، کەم کەس بووە کۆششی لە کارێکدا کردبێ ویستبێتی بە دەستی بهێنێت و صەبر هاوڕێی بووبێت، ئیللا ئەوەی ویستویەتی بەدەستی هێناوە.**

## بنچینەی دەیەم
## وابەستەبوون بە ئادابی عیلمەوە

**ئیبنولقەیم لە کتێبی** (مَدارج السالكين)**دا فەرموویەتی:** (أدبُ المرء عُنوانُ سعادته وفلاحه، وقلّةُ أدبه عنوان شقاوته وبواره، فما استجلب خير الدنيا والآخرة بمثل الأدب، ولا استُجلبَ حِرمانُهما بمثل قلّة الأدب)، **واتە: ئەدەبی ئینسان ناونیشانی بەختەوەری و ڕزگارییەتی، وە کەمی ئەدەبی ناونیشانی نەگبەتی و تیاچوونیەتی، جا خێری دونیا و ئاخیرەت وەدەست ناهێنرێت بە وێنەی ئەدەب، وە لێشیان مەحروم نابێت بە وێنەی کەمی ئەدەب.**

**پاشان بەیتە شیعرێکی شاعیرێکی باسکردووە کە فەرموویەتی:**

والمرءُ لايَسمو بغير الأدبِ وإن يكن ذاحسب[10] ونسبِ[11]

**واتە: ئینسان بە غەیری ئەدەب پایەبەرز نابێ، وە ئەگەرچی خاوەنی حەسەب و نەسەبیش بێت.**

---

**١٠ حەسەب، واتە: سەروەری و جوامێری و شەریفی باوباپیران.**

**١١ نەسەب، واتە: خزمایەتی و نەژاد.**

پاشـان وتویـەتی: تـەنها کەسـێك شـیاوی عـیلم ئـەبێت پـەیڕەوی ئادابی عـیلم بکـات لـە نەفسـی خـۆی و وانەکەیـدا، و لەگـەڵ مامۆسـتا و هاوڕێشیدا. واتە: بێ ئەوە نابێت بەیەکێك لە ئەهلی عیلم.

یوسفی کوڕی حوسەین فەرمویەتی: (بالأدب تَفهَمُ العلم)، واتـە: بـە ئەدەب لەزانست ئەگەیت.

چوون ئینسان بە ئەدەب بە ئـەهل و شـیاو ئـەزانرێ بـۆ عـیلم هـەتا بۆی بەخت بکرێ، وەگران ئەکرێ بۆ کەم ئەدەب کە لای زایە بکـرێ. جـا ئەگەر شتێکت لەعیلم لەلای کەسێکی کەم ئـەدەب بینـی، ئـەوە بزانـە کـە ئەوەی لایەتی وێنەی زانستە نەك حەقیقەتی زانست، چـوون حەقیقـەتی زانسـت ئـەوەی کـە ئینـسان لـە چێـژ و لـەزەتی عـیلم و هـۆگری بـەخوا و بێنـازی لـە خـەڵك دەسـتی دەکـەوێت، ئینـسانی کـەم ئـەدەب یـاخود بـەد ئـەدەب دەسـتی ناکـەوێ، وەئەگـەر چـی وێنـە و صـورەتی زانسـتی لـە لا دەست بکەوێت.

پیاوێك داوای لە (ئەلبوقاعی) کرد لەلای بخـوێنێ، ئـەویش ئیزنـی پێیدا، جا پیاوەکە هات چوارمشقی دانیشت، ئەلبوقاعی لە پێخوێندنی وازی هێنا و پێی فەرموو: (أنت أحوجُ الى الأدب منك الى العلم الذي جئت تطلبه)، واتـە: تـۆ پێویـستت بـە ئـەدەب زۆرتـرە تـا لـە عـیلم کـە هـاتووی تەڵەبی بکەیت.

وە لێرەشـەوە سـەلەف رحمهـم الله گرنگیـان بـە فێربـوونی ئـەدەب ئەدا وەك ئەوەی گرنگیان بە فێربوونی عیلم ئەدا.

بەڵ کۆمەڵ و طائیفەیەك لە سەلەف فێربوونی ئەدەبیان پێش دەخست بەسەر فێربوونی عیلمدا.

ئیمامی مالیك بە گەنجێكی قورەیشی فەرموو: (یا ابنّ أخي، تعلمِّ الأدبَ قبل أن تتعلَّم العلم)، واتە: برازاكەم، فێری ئەدەب ببە بەرلەوەی فێری زانست ببیت. وە ئەوان (واتە سەلەف) حاجە و نیازی خۆیان بۆ ئەدەب دەردەبڕی و ئاشكرایان دەكرد.

مەخلەدی كوڕی حوسەین ڕۆژێك بە ئیبنولموبارەك دەڵێت: (نحنُ الى كثير من الأدب أحوجِ منا الى كثير من العلم)، واتە: ئێمە پێویستمان بە زۆرتر لە ئەدەب هەیە هەتا بە زۆرێك لە زانست.

سەرنج بدە ئەوان لەگەڵ كەماڵی ئەدەبیشیاندا خۆیان هەر بە ناتەواو و كەموكورت زانیوە.

سەلەف رحمهم الله هەموو دەم وەسیەتیان بە ئەدەب دەكرد و ڕێنمایشیان بۆ دەكرد.

ئیمامی مالیك فەرموویەتی: دایكم لە كاتێكدا عیمامە و سەرپێچی بەسەرمەوە ئەپێچا پێمی ئەوت: (اذهب الى ربيعة فتعلّم من أدبه قبل علمه)، واتە: بڕۆ بۆلای ڕەبیعە[12] فێری ئەدەبی بە بەر لەوەی فێری عیلمەكەی ببیت.

بێگومان زۆرێك لە تەڵەبەی ئەم سەردەمە مەحروم بوون لە عیلم هەر بە زایەكردنی ئەدەب، ئەبینی یەكێكیان لە حزوری شەیخ و

---

١٢ ڕەبیعە كوڕی (عبدالرحمن) فەقیهی خەڵكی مەدینە بووە لە ڕۆژگاری خۆیدا و مامۆستای ئیمامی (مالیك)یش بووە.

مامۆستاکەیدا شانی دائەدا، بەڵ هەردوو قاچی درێژ ئەکات و دەنگ بەرز ئەکاتەوە لە پاڵیدا و هەر تەلەفۆنێکی بۆبێت یەکسەر پڕی دەداتیٚ و هەڵیدەگرێت و وەڵامی دەداتەوە، ئەوە چ ئەدەبێکە لەلای ئەوانەی عیلمی پیٚ بەدەست دێنن؟! خۆ ئەگەر عوزر و بیانوویەکی دروست یاخود حاجە و زەرورەتێك هەبیٚ بۆ ڕاکێشانی قاچەکانی یاخود بۆ وەڵامدانەوەی موبایل، ئەوە ئەگەر پێویست بوو با ئیزن بخوازێت پاشان بڕوات و خێرا قسە بکات و خێرا بگەڕێتەوە، یاخود هەر لە سەرەتای دەرسەکەوە موبایلەکەی دابخات.

لەیثی کوڕی سەعد سەرپەرشتی تەڵەبی عیلمی ئەکرد[١٣]، جا شتێکی لێیان بینی وەك ئەوەی پێی ناخۆش بووبێت فەرمووی: (ما هذا؟ أنتم إلى يسيرٍ من الأدب أحوجُ منكم إلى كثير من العلم)، واتە: ئەمە چیە؟ ئێوە نیازتان بە کەمێك لە ئەدەب زۆرترە لەوەی نیازتان بە زۆرێك لە زانست.

پاشان شێخ ئەڵێت: ئەگەر (لیث) حاڵی زۆرێك لە تەڵەبەی عیلمی لەم سەردەمەدا ببینیایە ئاخۆ چی ئەفەرموو؟!

---

١٣ تەڵەبی عیلم لەسەردەمی (سەلەف)دا بە زۆری تەڵەبی حەدیس بووە.

## بنچینەی یانزەهەم
## پاراستنی زانست لەوەی ناشیرینی بکات
## لەوەی موخالەفەی مروئەت و کەموکورتی ئەکات

ئیمامی شافعی فەرموویەتی: ئەوەی عیلم نەپارێزێت عیلمیش ئەو ناپارێزێت (مَن لم يصُنِ العلمَ لم يَصُنْه العلم)، وە ئەوەی کەلێنی کردە مروئەتەوە بە کەوتنە ناو ئەوەی ناشیرینی دەکات ئەوە سوکایەتی بە عیلم کردووە، جا لەبری ئەوە ئەبێ تەعزیمی بکات، جا ئەوەی تەعزیمی عیلمی نەکرد و کەوتە قەشمەری کردن، ئەیگەیەنێ بەوەی دەرەنجام ناوی زانستی لێ لاببردرێ.

زانای گەورە (وهب بن مُنبِّه) ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی: (لايكون البطّال من الحكماء)، واتە: قەشمەرچی لە حەکیمان نیە، وە لە ئەهلی عیلمیش نیە.

شاعیرێك ئەفەرموێ:

لايُدركُ العلمَ بَطّالٌ ولا كَسِلٌ ولا مَلول ولا مَن يألفُ البَشرا

ئەسڵ و هەقیقەتی مروئەت (واتە: ئینسانییەت) وەك ئەوەی ئیبنوتەیمیەی باپیر لە (المحَـرِر)داو نەوەکەشی لە هەندێك لە فەتواکانیدا شوێنی کەوتووە ئەوەیە فەرموویەتی:

(استعمالُ مايُجمِّلُه ويزينه، وتَجنُّبُ مايَدنسُه ويشينهُ)، واتە: ئەسڵ و حەقیقەتی مروئەت و ئینسانیەت: بەکارهێنانی ئەو شتەیە جوانی دەکات و دەیڕازێنێتەوە و دوورکەوتنەوەیە لەوەی پیس و پۆخڵ و ناشیرینی دەکات.

کەسێك دێت پرسیار لە أبو محمد سوفیانی کوڕی عویەینە ئەکات و ئەڵێت: تۆ هەموو شتێکت لە قورئان هەڵێنجاوە، ئەی مروئەت لە کوێدایە؟ ئەویش فەرمووی: (في قوله تعالى: {خُذ العفو وأمُر بالعُرف وأعرض عن الجاهلين}(الأعراف:١٩٩)، ففيه المروءةُ، وحُسن الأدب، ومكارمُ الأخلاق)، واتە: لە فەرمایشتی خوادایە: (خُذ العفو وأمُر بالعُرف...)، جا مروئەت و جوانی ئەدەب و ڕەوشتگەلە چاکەکانی هەموو تێدایە.

شێخ پاشان وتویەتی: وە لە نیازمەندترین ئەدەبی نەفس بۆ فێرخواز: ڕازاندنەوەیەتی بە مروئەت و ئەوەی هەڵیئەنێت لەسەری و دوورکەوتنەوەشیەتی لەو شتگەلەی مروئەت ناهێلێت و کەلێنی تێدەکات، وەك تاشینی ڕیش، جا ئیبنوحەجەری هەیتەمی لە شافعییەکان و ئیبنوعابدین لە حەنەفییەکان لە (خوارم المروءة) و ئەو شتگەلە ئەژماریان کردووە کە کەلێن ئەخاتە ناو مروئەتەوە.

یاخود زۆر لاکردنەوە و ئاوڕدانەوە لە ڕێگەدا، ئەویش هەریەکە لە ئیبنوشیهابی زوهری و ئیبراهیمی نەخەعی لە زانایانی پێشوو (من العلماء المتقدمين) لە (خوارم المروءة) ئەژماریان کردووە.

یاخود قاچ درێژکردن لە ناو کۆمەڵ و مەجلیسدا بەبێ ئەوەی حاجە و زەرورەت ئەوە بخوازێت، ئەویش کۆمەڵێ لە زانایان لە ناویاندا أبوبكر الطرطوشي لە مالیکیەکان و ابو محمد ابنُ قُدامة و أبو الوَفاء ابن عَقيل لە حەنبەلیەکان لە (خوارم المروءة) ئەژماریان کردووە.

یاخود هاوڕێیەتی مرۆڤگەلی هەرچی و پەرچی و سەرسەری و کەم شەرم و قەشمەرچی، ئەویش کۆمەڵێك لە زانایان لە ناویاندا أبو حامد الغزالي و ابو بكر بنُ الطيِّب لە شافعیەکان و قازی عياض اليَحصُبي لە مالیکیەکان لە (خوارم المروءة) ئەژماریان کردووە.

یاخود زۆرانبازی لەگەڵ منداڵان و تازەپێگەیشتووان هەریەك لە ابن الهُمام و ابنُ نُجَيْم لە حەنەفیەکان لە (خوارم) ئەژماریان کردووە.

پاشان شێخ وتویەتی: وە ئەوەی کەلێن بکاتە مروئەتی خۆیەوە و نیسبەتی خۆیشی بە عیلم بدات، ئەوە نەنگیەکانی لەلای خاس و عام ئاشکرا ئەبن و ئاوڕووی ئەچێت و بە هیچ شتێك لە شەرەفی عیلم ناگات ئیللا شتێکی کەم نەبێ وەك وردە نان یاخود هەرشتێکی تر وەك پووش و پەڵاش.

# بنچینەی دوانزەهەم
# هەڵبژاردنی برادەرێتی چاك بۆی

ئینسان بە سرووشت مەدەنی یە و گرتنی هاوڕێ زەرورەتێکی پێویستە لە دەرونی خەڵکدا، جا فێرخوازی زانست ئیحتیاج و نیازی بە برادەرێتی و موعاشەرەی غەیری خۆی لە فێرخوازان ئەبێ بۆ ئەوەی ئەم برادەرێتی و موعاشەرەیە هاوکاری بێت لەسەر تەحصیلی عیلم و هەوڵدان و ئیجتیهاد لە تەڵەبکردنیدا.

زەمالە، واتە: هاوڕێیەتی لە زانستدا ئەگەر سەلامەت بێت لە شەڕوخراپە سوودبەخش ئەبێت لە گەیشتن بە مەقصود.

وە جوان نیە بۆ قاسیدی مەتڵەبگەلە باڵاکان (لە سەروشیانەوە زانست) ئیللا هەڵبژاردنی برادەرگەلی چاك نەبێ کە یارمەتی بدات ، چوون برادەر ئەسەر و کاریگەری لە برادەریدا هەیە.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (الرجل على دين خليله، فلينظر أحدُكم مَن يُخالل) رواه أبوداود والترمذي: وهو حديث حسن.

واتە: پیاو (مرۆڤ) لەسەر ئاییینی برادەرەکەیەتی، جا با هەریەکێك لە ئێوە سەیر بکات برادەری لەگەڵ کێ دەکات.

**راغبی ئەصفەهانی ئەفەرموێ:** (ليس إعداءُ الجليس لجليسه بمقاله وفعاله فقط، بل بالنظر اليه)، **واتە: ئەسەری هاونشین بۆ هاونشینەکەی تەنها بە وتەی و کرداری نیە، بەڵ بە ڕوانینیشە بۆی.**

لا تَصحبِ الكسْلان في حالاتهِ　　كم صالح بفسادِ آخرَ يَفسُدُ
عدوى البليد الى الجليد سريعةٌ　　كالجمر يُوضَعُ في الرَّمادِ فيخمُدُ

**واتە: هاوڕێیەتی تەمبەڵ مەکە لە حاڵەتەکانیدا، زۆر کەسی چاك هەیە بە خراپی کەسێکی دیکەوە خراپ ئەبێ، گواستنەوەی پەتای نازیرەك بۆ زرنگ و چوست و چالاك خێرایە، وەك پشکۆ لە خۆڵەمێشدا دابنرێ خێرا دائەمرکێت، ئەویش ئاوا زوو ئەسەر و کاریگەری هەیە لەسەر ئەو.**

**پاشان ئەڵێت: هەر ئەبێ کەسێك هەڵبژێردرێت بۆ هاوڕێیەتی موعاشەرە لەبەر فەزیلەت بکات نەك لەبەر مەنفەعەت و تام و چێژ و لەزەت، چوون گرێبەستی موعاشەرە لەسەر ئەم سێ مەتڵەبە توند و تۆڵ و تۆکمە ئەکرێ، فەزیلەت و مەنفەعەت و لەززەت وەك ئەوەی مامۆستای مامۆستاکان** (محمدُ الخَضِر بنُ حسين) **لە** (رسائل الإصلاح)**دا باسی کردووە.**

**پاشان شێخ وتویەتی: برادەری فەزیلەت هەڵبژێرە بە هاوڕێ، چوون تۆ بەو دەناسرێیت، واتە: بەهۆی هاوڕێیەتیتەوە بۆ ئەو خەڵك تۆ دەناسێت کە کەسێکی چاك بیت.**

**ئیبنومەسعود فەرمویەتی:** (اعتبروا الرجل بمَن يُصاحبُ، فإنما يُصاحبُ الرجلَ من هو مثلُه)، **واتە: پیاو (مرۆڤ) بەو کەسەدا بناسنەوە هاوڕێیەتی دەکات، بێگومان مرۆڤ هاوڕێیەتی کەسێك ئەکات هاوشێوەی خۆی بێت.**

**وە** (ابو الفتح البُستي) **بۆ خۆی ئەم دوو بەیتەی بەدەنگی بەرز خوێندەوە:**

اذا ما اصطنعت امراً فليكنْ شريفَ النَّجار زكيَّ الحَسَبْ

فَنَذْلُ الرجال كنذْلِ النباتِ فلا للثِّمارِ ولا للحَطَبْ

**واتە: کاتێك کەسێکت هەڵبژارد (بۆ هاوڕێیەتی) با ئەو کەسە ئەسڵ و نەسەبی شەریف و حەسەبی پاك بێت، جا قەڵبی پیاوان وەك قەڵبی ڕووەکە، جا ڕووەکی قەڵب نە بۆ بەروبوم ئەبێت و نە بۆ دارە چیلەش ئەبێت.**

**وە** (ابنُ مانع) **لە** (ارشادُ الطلاّب)**دا لە کاتێکدا وەسیەت بۆ زانستخواز دەکات دەفەرموێ:** (ويحذَرَ كلَّ الحُذر من مُخالَطة السفاء وأهل المُجون والوَقاحة وسيّئ السُّمعة والأغبياء والبُلَداء، فإن مُخالطتَهُمْ سببُ الحِرمان وشقاوةِ الإنسان)، **واتە: وە با بەتەواوی حەزەر بکات لە کەسانی کاڵفام و کەمشەرم و ڕوودار و ناوبانگ خراپ و گەوج و گەلحۆ، چوون تێکەڵاوییان هۆکاری مەنعی عیلم و بەدبەختی ئینسانە.**

**وە ئەمە وەك عەینی وتەکەی سوفیانی کوڕی عویەینەیە، سوفیان فەرموویەتی:** (إنّي لَأَحرِمُ جُلسائي الحديث الغريب لموضع رجل واحد ثقيل)،

واتە: بێگومان ئەهلی مەجلیسەکەم مەنع و مەحروم ئەکرد لە حەدیثی غەریب لەبەر ئامادەبوونی پیاوێکی ڕەزاگران.

سوفیان ڕەحمەتی خوای لێبێت لەبەر ئامادە بوونی کەسێك کە شایەنی عیلم نەبوو، لە مەجلیسەکەدا تەڵەبەکانیشی مەنع ئەکرد لەوەی فەرمودەیان بۆ بگێڕێتەوە.

هەڵبەت فێرخواز لە عیلم مەحروم و مەنع ئەکریٚ لەبەر هاوڕێیەکەی، جا لەم جۆرە حەزەر بکە و وریای خۆت بە –ئەگەر خۆیشی بە پۆشاکی عیلمەوە بنوێنیٚ و عەرز کبات– ئەوە تێکت دەدا لە شوێنێکەوە هەست ناکەیت.

بۆیە ئینسان ئەبێت برادەری کەسێك هەڵبژێرێت جوانی بکات لە وەرگرتنی عیلمدا و یارمەتی بدات لەسەری و نزیکی بکاتەوە لێیەوە و لە لای خۆشەویستی بکات، جا بێگومان برادەرێتی وەك ئەمە یارمەتیت ئەدا لەسەر بڕینی ڕێگە بۆلای (الله)...

## بنچینەی سیانزدەهەم
## بەختکردنی توانا و تاقەت لە دەرخکردنی زانست
## و موزاکەرە پێکردنی و پرسیارکردن لە بارەیەوە

شێخ سیٚ بنەمای لە وەرگرتنی عیلمدا باس کردووە:

یەکەم: دەرخکردنی.

دووەم: موزاکەرە، واتە: مودارەسەکردنی لەگەڵ هاوەڵان.

سێیەم: پرسیارکردن لێی، واتە: پرسیارکردن دەربارەی لە ئەهلی خۆی.

شێخ بەوە دەستی پێکردووە پەیوەندی و تەعەللوقی بە (حفظ) و دەرخکردنەوە هەیە و وتویەتی: چوون وەرگرتنی علم لە شیوخی عیلمەوە بەبیٚ دەرخکردن و موزاکەرە و پرسیارکردن لەبارەیەوە سودی بۆی نابیٚ، ئەو سیانە لە دڵی زانستخوازدا تەحقیقی گەورەڕاگرتنی عیلم دەکات بە کەماڵی ئاوڕدانەوە لێی و خەریکبوون پێیەوە، هەڵبەت دەرخکردن خەڵوەیە لەگەڵ نەفسدا، وە موزاکەرەش دانیشتنە لەگەڵ هاوڕێدا و پرسیار کردنیش چوونە خزمەتی ئەهلی عیلم. بە دەرخکردن عیلم لە دڵدا جێگیر ئەبیٚ، بۆیە ئەبیٚ زۆری هیممەتی فێرخواز سەرف بکریٚ بۆ دەرخکردن و ئیعادەکردنەوە، وەك ئەوەی ئیبنولجەوزی لە

(صيد الخاطر)دا فەرمويەتی، وە بەردەوام زانایانی گەورە هانی تەڵەبەی عیلمیان ئەدا لەسەر دەرخکردن و فەرمانیشیان پێدەکرد.

عُبیدالله کوڕی حەسەن فەرموویەتی: (وجدتُ أحضرَ العلمِ منفعَة: ما وعيتهُ بقلبي ولُكْتُهُ بلساني)، واتە: حازرترینی زانست لە ڕووی کەڵك و سودەوە پێمزانی بێت ئەوەیە بە دڵم تێیگەیشتووم، و زمانیشم پێی جوڵاندوە. واتە: لێی حاڵی بووم و دەرخم کردووە.

ئەوەی ئەیەوێ شتێك دەرخ بکات، ئەبێ دەنگی پێ هەڵبڕێ، بۆ ئەوەی بە هەڵبڕینی دەنگ ئیستیعانە بکات لەسەر سەبات و جێگیربوونی واتا و مانا لە دڵدا، چوون دەرخکردن بە کۆکردنەوەی دوو ئالەتەوە ئەبێ: چاو و گوێ، جا کاتێك ویستت شتێك لەبەر بکەیت سەیری بکە و دەنگیشت هەڵبڕە، واتە: دەنگت بەرزبکەرەوە.

وە کاتێکیش ویستت لە شتێك تێبگەیت و فەهمی بکەیت، دەنگت پێی نزم بکەرەوە...

پاشان وتەیەکی (ابن عثيمين) باسدەکات و دەڵێت: وسمعتُ شيخنا ابن عُثيمين يقول: (حفظنا قليلاً وقرأنا كثيراً، فانتفعنا بما حفظنا اكثرَ من انتفاعنا بما قرأنا)، واتە: گوێم لە شێخمان (ابن عثيمين) بوو ئەیفەرموو: کەممان دەرخکرد و زۆرمان خوێندەوە، زۆرتر سودمان لەوە بینی دەرخمان کردبوو نەك لەوەی خوێندبوومانەوە.

پاشان بەیتێکی خەلیلی کوڕی ئەحمەدی باسکردووە، ئەمەش بەیتەکەیە:

ليس بعلمٍ ماحوى القِمَطْرُ ما العلمُ الاّ ماحواهُ الصَّدرُ

**واتە: ئەوە عیلم نیە جانتای کتێب لە خۆی گرتووە، بەڵ عیلم ئەوەیە سینگ لەخۆی گرتووە و کۆی کردووەتەوە.**

**پاشان شێخ ئەڵێت: ئەوەی بەدوای عیلم دەکەویٚ بێناز نابیٚ لە دەرخکردن، وەلێی جوان نیە واز لە دەرخکردن بهێنێت، وە کاتێك توانی ئەوەی** (ابنُ الفرات) **ئەیکرد ئەویش بیکات با دەستپێبکات، ئەو هەموو ڕۆژێك بەیانی ڕۆژی ئەکردەوە شتێکی دەرخ ئەکرد ئەگەر کەمیش بوایە، وە ئەوەی لەمەگەیشت بەردەوام لە دەرخکردنی زیاددایە، جا بەوشێوەیە ئەتوانیٚ بەردەوام بیٚ لەسەر دەرخکردن هەتا مردن، وەك ئەوەی بۆ** (ابنُ مالك) **خاوەنی** (ألفية) **لە زانستی** (نحو)**دا ڕێککەوتبوو، ئەو زاتە لە ڕۆژی مردنیدا پێنج** (شەواهید)**ی لە شیعردا لەبەرکرد.**

**ڕاڤەکاریش باسی** (ابو الفرج ابن الجوزي) **کردووە و وتویەتی: وە بۆ** (ابو الفرج ابن الجوزي)**یش ڕێککەوتبوو کە هەر دە قیرائەتەکەی قوڕئانی لە دوای هەشتاساڵیەوە لەبەرکرد.**

**وە دواتر باسی** (ابن هشام النحوي) **دەکات کە تەمەنیشی گەورە بووە** (مختصر الخِرَقي) **لەبەرکردووە.**

**پاشان شێخ باسی موزاکەرەی کردووە و وتویەتی: وە بە موزاکەرە ژیانی زانست بەردەوام ئەبیٚ لە نەفسدا، وە وابەستە بوونیشی پێیەوە بەهێز ئەبیٚ، مەبەست بە موزاکەرە** (مُذاكرة)

مودارەسەی هاوڕێیانە، واتە: ئەوەیە تۆ و هاوڕێکانت کۆببنەوە، جا ئەوەی فێری بوون و خوێندووتانە و لەبەرتان کردوە و فەهمتان کردووە بەیەکتری بڵێنەوە یاخود گوێ لەیەکتر بگرن ئەگەر بە لەبەر بۆ یەکترتان دەخوێندەوە. پاشان شێخ دەڵێت. وە بێگومان فەرمانمان پێکراوە بە (تەعاهود) و بایەخدان بەو قوڕئانەی خوا ئاسانی کردووە بۆ پەند و ئامۆژگاری.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (انما مَثَلُ صاحبِ القرآن كمثل صاحب الإبل المعلقة، إن عاهد عليها أمسكها، وإن أطلقها ذهبت) رواه البخاري، ورواه مسلم من حديث مالك به نَحوَهُ. واتە: بێگومان خاوەنی قوڕئان وەك وێنەی خاوەنی حوشتری بەستراوە وایە، ئەگەر چاودێری و ئاگاداری کرد، هێشتوویەتیەوە، وە ئەگەریش بەرەڵلاو ئیهمالی کرد ئەوە ڕۆشتووە. ابن عبدالبر لە کتێبی (التمهید)دا فەرمویەتی: (واذا كان القرآن الميسَّر للذكر كالإبل المعلقة، مَن تعاهد أمسكها فكيف بسائر العلوم؟!)، واتە: کاتێك قوڕئانی ئاسانکراو بۆ پەند و ئامۆژگاری وەك حوشتری بەستراوە وابێ ئەوەی بایەخی پێداو چاودێری کرد هێشتوویەتیەوە، ئەی ئەبێ باقی زانستەکان چۆن بن؟!

ئیمامی زوهری ئەفەرموێ: (انما يُذهبُ العلمَ النسيانُ وتركُ المذاكرة)، واتە: بێگومان لەبیرچوونەوەو وازهێنان لە موزاکەرە زانست لەبەین ئەبات.

پاشــان شــێخ باســی کــەڵك و ســوودی پرســیارکردنی کــردووە و وتویەتی: وە بەسوئال کردن لە عیلم خەزێنـەکانی ئیفتتـاح دەکرێن، وە دیــسان ئیمــامی زوهــری فەرمویــەتی: (انمـا هـذا العلمُ خـزائنُ، وتفتتحهـا المــسألة) واتــە: هـــەر ئـــەم زانـــستە خەزێنەگەلێکـــە، پرســـیارکردن ئیفتیتاحیان دەکات.

پاشان شێخ ئەڵێت: وە جوانی پرسیارکردن نیوەی زانستە، وە ئەو پرسیارانەی لـە دوو تـوێی کتێبێکدا نووسراون – وەك مەسائیلی گێڕدراوە لـە ئیمـام ئەحمـەدەوە – بەڵگەیـەکی ڕوونـە لەسـەر گـەورەیی کەڵك و سوودی سوئال کردن.

وە کـەمی ڕووکردنـە زانـا بـە پرسیارکردن کاتێك ئەچێتە شارێك ڕادەی زانستی خەڵکی ئەو شارە لە زانست دەردەخات.

پاشان باسی سوفیانی ثەوری کردووە کە چووە بۆ عەسقەلان و سـێ ڕۆژ لـەوێ ماوەتـەوە هـیچ کەسـێك لـە هـیچ شـتێك پرسـیاری لێـی نـەکردووە، پاشــان جێــی هێــشتووە و ڕۆشــتووە و فەرمویــەتی: ئەمــە شارێکە زانستی تێدا ئەمرێ: (...هذا بلد یموت فیه العلم).

جا ئەوەی بە شێخ و زانایەك گەیشت با ئەوە بە پرسیارلێکردنی لـەوەی ئیـشکاڵی تێیـدا هەیـە و نیـازی پێـی هەیـە بقۆزێتـەوە، نـەك پرســیارکردنی ملەجەڕەکــەر یــاخو تاقیکــەرەوە. پاشــان کۆتــایی ئــەم بنـچینەیەی بـەم وتەیـەی هێنـاوە و وتویـەتی: وە ئـەم سـێ واتایـە بـۆ زانـست: وەك ناشـتنی دار و ئـاودانی و پێگەیاندنیـەتی بـەوەی هێـز و

قوەتی بپارێزێت و دەفعی ئافەتی لێ بکات، جا دەرخکردن ناشتنی زانستە و موزاکەرە ئاودانیەتی و پرسیارلێکردنی پێگەیاندنیەتی.

شێخ دەرخکردنی زانستی چواندووە بە ناشتنی نەمامەوە و موزاکەشی چواندوە بە ئاودانیەوە و پرسیارلێکردنیشی چواندووە بە پێگەیاندنی و گەورەکردنیەوە.

## بنچینەی چواردەهەم
## ڕێزگرتنی زانایان و گەورەڕاگرتنیان

بەڕاستی فەزڵی زانایان گەورەیە، وە پۆستەکەشیان پۆستێکی مەزنە، چوون ئەوان باوانی گیانن، جا شێخ (واتە:زانا) باوکە بۆ ڕۆح وەك ئەوەی باوك باوکە بۆ لەش، وە لە قیرائەتی ئوبەی کوڕی کەعبدا (رضي الله عنه) هاتوە: (النبيُّ أولى بالمؤمنين من أنفسهم وهو أب لهم)، وە باوکایەتی باسکراو لەم خوێندنەوەیەدا باوکایەتی نەسەب نیە بە ئیجماع و یەکدەنگی زانایان، بەڵ هەر باوکایەتی دینی ڕۆحیە، جا داننان بە فەزڵی فێرکاراندا مافێکی واجب و جێگیرە. ڕاڤەکار دەڵێت ئیبنو تەیمیەی حەفید فەرمویەتی: (الشيخُ والمعلِّم والمؤدّب أب للروحِ، والوالدُ أب للجسد[14]).

پاشان شێخ وتەیەکی شوعبەی کوڕی حەججاج نەقڵ ئەکات و ئەڵێت: شوعبەی کوڕی حەججاج فەرمویەتی: (كلُّ مَن سمعتُ منهُ حديثاً فأنا له عبد) هەرکەسێك فەرمودەیەکم لێیەوە بیستبێت ئەوە من کۆیلەییم. واتە: قەرزاریم و لە چاکەی دەرناچم هەتا وەك کۆیلە دەبم بۆی بەو هۆیەوە.

---

١٤ بڕوانە: (مدارج السالكين)

ئـەم مانایــە (محمـد بـن علـى الأُدفُـوِيّ) لــە قورئــان دەریهێنــاوە و فەرمویەتی: (اذا تعلَّم الانسانُ من العالم واستفاد منه الفوائد، فهو له عبد، قال الله تعالى: ﴿واذ قال موسى لفته﴾ (الكهف: ٦٠) وهو يوشُع بن نون، ولم يكن مملوكا له، وانما كان مُتلمِّذاً له، مُتبعاً له، فجعله الله فتاه لذلك)، واتـە: کاتێك ئینـسان لــە زانــاوە فێربــوو و ســوودگەلێکی لێیــەوە وەرگــرت، ئــەوە کۆیلەیە بۆی، جا ئەم زانایە بەڵگەی بەو ئایەتە هێناوەتەوە و وتویەتی: قال الله تعالى: (واذ قال موسى لفته) (الكهف: ٦٠) باسـی ئـەو وەختـە بکـە موسـى بـە کۆیلەکـەی خـۆی وت... هتـد، ئـەویش یوشـەعی کـوڕی نـون بوو، مەملوك و کۆیەشی نەبوو، بەڵ هەر قوتابی و پەیڕەوکاری بوو، جا خوا ناوی (فتى) کۆیلەی بەسەردا بڕیوە لەبەرئەوە.

وە بێگومان شەرع فەرمانی کردووە بـە ریعایـەت و چاودێری مافی زانایان بە ڕێزگرتن و گەورەڕاگرتن و ئیعزاز بۆیان.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویـەتی: (ليس من أُمتي مَن لم يُجلَّ كبيرنا، ويرحمْ صغيرنا، ويعرفْ لعالمنا حقَّه) رواه احمد.

واتـە: ئـەوەی ڕێـزی گـەورەمان نـەگرێت و بـەزەیی بـە بـچوکماندا نەیەتەوە و مافی زانامان نەزانێ لە ئوممەتی من نیە.

ئیبنو عـەباس رضي الله عنهما ڕۆژێك جڵـەوی حوشترەکەی زەیـدی کـوڕی ثابـتی گـرت، زەیـد فـەرمووی: (أتمسُك لي وأنت ابنُ عمّ رسول الله ﷺ؟ فقال ابن عباس: (انا هكذا نصنعُ بالعلماء)، واتـە: ئایـا تـۆ جڵـەوی

ولاخەکەم بۆ ئەگری؟ ئەویش فەرموی: ئێمە ئاوا لەگەڵ زاناکانماندا دەکەین.

وە ئیبنو حەزم لەسەر گەورەڕاگرتن و ڕێزلێنانی زانایان ئیجماعی نەقڵ کردوە. وە بینا بە ئەحواڵی سەلەفیەت (واتە: بەوەی سەلەفی صالحی لەسەر بووە) لەسەر ئەحواڵی ستایشکراویان ئەوەستێت و هەڵوێستە دەکات لە تەوقیر و گەورەڕاگرتنی زانایان، جا بێگومان هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ کاتێک لە خزمەتی پێغەمبەردا دائەنیشتن جوڵەیان نەئەکرد وەك ئەوە کە باڵندە بەسەر سەریانەوە بێت.

وە (محمد بن سیرین) فەرمویەتی: (رأيتُ عبدالرحمن بن أبي ليلى وأصحابه يعظّمونه ويُسوِّدونه ويُشرِّفونه مثلَ الأمير)، واتە: ئیبنو ئەبی لەیلام بینی هاوەڵانی (قوتابیەکانی) تەعزیمیان ئەکرد و گەورە و گران و بەرزیان ڕائەگرت وەك فەرماندە.

وە (يحيى الموصلي) فەرمویەتی: (رأيتُ مالك بنَ أنس غيرَ مرّةٍ، وكان بأصحابه من الإعظام له والتوقير له، واذا رفع احدٌ صوته صاحوا به)، واتە: چەند جارێك مالیکی کوڕی ئەنەسم بینیوە قوتابیەکانی چەندە گەورە و گران ڕایانگرتبوو، وە کاتێک کەسێك دەنگی بەرز بکردبایەتەوە هاواریان بەسەردا دەکرد.

جا لە ئەدەبی پێویست بۆ شێخ لەسەر فێرخواز – لەوەی دەچێتە ژێر ئەم بنەمایەوە – تەوازوع بۆ شێخ و پێشوازی لێکردنی و

هەڵنەگەڕانەوە لێی و ڕەچاوکردنی قسەیە لەگەڵیدا، وە کاتێك قسەی لێوە کرد تەعزیمی بکات بێئەوەی (غلو)و زێدەڕەوی تێدا بکات، بەڵ لە پێگەی خۆی بەرزتری نەکاتەوە، نەبادا ناشیرینی بکات لەجیاتی ئەوەی بیەوێ ستایشی بکات، وە با سوپاسی بکات لەسەر فێرکردنی و نزاشی بۆ بکات و بێنیازبوونی خۆی لێ ئاشکرا نەکات (بەڵ هەمیشە وانیشان بدات پێویستی بە عیلمی ئەوە)، وە ئازاریشی نەدا نەبە وتە نەبە کردە، وە با نەرم و بە لوتف بێت لە ئاگادارکردنەوەیدا لەسەر هەڵەکردنی ئەگەر هەڵە و زەللەیەکی کرد.

وە لەوەی موناسیب بێت لێرەدا ئاماژەی بۆ بکەین – بە کورت بڕی و کورتی – زانینی ئەو شتەیە واجبە بەرامبەر هەڵەو زەللەی زانا، ئەویش شەش شتە:

یەکەم: لێکۆڵینەوە لە دەرچوونی هەڵەکە لێیەوە، هەندێك جار نیسبەتی زەللەیەك یاخود هەڵەیەك بەکەسێك ئەدرێ کەچی ئەو کەسە لێی بەرییە، چوون نەقڵی خەڵك بەزۆری ڕەشمە و جڵەوی نییە.

دووەم: لێکۆڵینەوە لە بوونی ئەو زەللەیە هەڵەبێت وە ئەمە ئەرك و وەزیفەی زانایانی ڕۆچووە لە زانستدا، جا بۆ ئەوە پرسیار لە ئەوان ئەکرێ دەربارەی ئەوە، ئایا لە شەرعدا هەڵەیە یان نا؟

شاعیر ووتویەتی:

وکم من عائبٍ قولاً صحيحاً وآفتُه من الفهم السقيمِ

واتە: زۆر عەیبگۆ هەیە، عەیب لە وتەیەکی دروست دەگرێت و ئافەتەکەشی لە تێگەیشتنی نەخۆشەوەیە.

حکومدان بەسەر شتێکدا کە ئەو شتە هەڵەیە، یان ڕاست، ئەوە ئەرکی زانایانی ڕۆچووە لە زانستدا، چوون زۆرجاری وا بووە کەسێك حوکمی داوە بەسەر وتە یاخود کردەوەی زانایەك یاخود کۆمەڵێکدا بەوەی هەڵەیە، بەڵام لە ڕاستیدا هەڵە نەبووە، نەك هەر هەڵە نەبووە بەڵ شەرعی و دروستیش بووە.

بەڵکو هەندیٚ عەیبگۆ ئامانجێکی سیاسی، یان بەرژەوەندیەکی هەیە لەوەدا !! هەڵبەت جیاکردنەوەی هەڵە و ڕاست و هەق و باتڵ و شەرعی و غەیر شەرعی ئەرکی زانایانی شەرع و ڕۆچووە لە زانستدا، چوون ئەوان مەرجیعی موسوڵمانانن لە تەحقیق و لێکۆڵینەوە لە کارێك لە یەکێك لە زانایانەوە، یاخود لەهەر کۆمەڵێکیانەوە دەردەچێت کە زەللە و هەڵەیە یان نا، هەقە یان باتڵ، شەرعی یە یان غەیر شەرعی یە.

سێیەم: وازهێنان لە پەیڕەویکردن و شوێنکەوتنی تێیدا، ئەگەر بۆی ڕوون بوو بووەوە زەللە و هەڵەیە، وە جگە لەوە پێویستە بەڕائەتی خۆیشی لە زەللە و هەڵەکە بکات.

چوارەم: عوزر و بیانوی بۆ بهێنێتەوە، ئەویش بە تەئویلکردنێکی ڕەوا و دروست بەوەی ئەگەر قسەیەکی کردبوو قسەکەی وا لێك بداتەوە کە مەبەستی خراپ و قەسدی هەڵە نەبووە، چوون ئەوە لە زانا تەصەور

ناکرێت.. جا کاتێك زانایەك هەڵەیەکی کرد گومانی باش پێی ئەوەیە کە نەیویستووە ئەو هەڵەو زەللەیە بکات.

پێنجەم: نەسیحەت کردنی بە لوتف و نەرم و نیانی و نهێنی، نەك بە توندوتیژی و تەشهیر کردن، چوون مەقسود لە بەیانی هەڵەکەی گێڕانەوەیەتی لێی، وە ئەوەش هەر بە لوتف و نەرم و نیانی و نهێنی و دوو بە دوو ئەبێ.

شەشەم: پاراستنی قەدر و کەرامەتی لە دڵی موسوڵمانانندا نەك بە پێچەوانەوە. بەڵ هەر زانایەك پێگە و مەقامی لە عیلم و سوننەدا سابت بوو بوو قەدر و کەرامەتی دەپارێزرێ بە تەعزیم بۆ شەریعەت.

وە لەوەی حەزەری لێدەکرێ لەوەی پەیوەندی هەبێت بە تەوقیر و گەورە ڕاگرتنی زانایانەوە: ئەوەیە وێنە و صورەتەکەی تەعزیم و تەوقیرە و ئەنجام و ئاکامەکەشی ئیهانە و تەحقیرە وەك ئیزدیحام و جەنجاڵی لەسەر زانا و تەزییقکردنی لە ڕێگەدا وەك ئەوەی ئەهلی حەدیث لە تەوقیر و تەعزیمیان بۆ هوشەیمی کوڕی بەشیری واسطي ئیزدیحام و جەنجاڵیان لەسەر دروست کرد هەتا بەو هۆیەوە لەسەر گوێدرێژەکەی بەریان دایەوە، جا هەر ئەوەش هۆکاری مردنەکەی بوو ڕەحمەتی خوای لێبێت.

## بنچینەی پانزدەهەم
## گێڕانەوەی ئەوەی ئیشکالی تێدایە بۆ ئەهلی عیلم

ئـەوەی عـیلم گـەورە ڕائـەگرێ و ئیعتیمـاد ئەکاتـە سـەر زانایـانی گەورە و بیرتیژ بۆ حەللی موشکیلاتی عیلم، وە خۆیشی لـە شتێك نـادا لە توانا و تاقەتیـدا نـەبێ و نـەتوانێ پێـی هەسـتێت بـە ترسـان لـە ووتـن لەسـەر خـوا بـەبێ زانـست و درۆ هەڵبەسـتن لەسـەر دیـن، چـوون ئـەو لـە تـوڕەیی ڕەحمـان ئەترسـێت بەرلـەوەی لـە قامـچی سـوڵتان بترسـێت، بێگومان زانایان بە عـیلم دواون و بـە چاوێکی کراوەوە بێدەنگ بـوون، جا ئەگـەر قسەیان لـە شـتێکدا کردبـوو کـە ئیشکاڵی تیـا بووبـێ تـۆش قسەکەی ئەوان بکە، وە ئەگـەر سکوتیان لێکردبوو تـۆش سکوتی تێدا بکە و کیفایەت بەوە بکە ئەوان کیفایەتیان پێکردووە.

وە لــە گــرانترینی گرفتــەکان ئــەو فیتنانــەن ڕوویــان داوە و ئــەو کارەساتانەن تازەن و لەگەڵ درێژبوونەوەی زەمەنـدا زۆر ئـەبن و ڕوو لـە زیـاد بـوون ئەکـەن، خەڵکەکـەش لـەم بابـەدا دوو تـەرەف و وەسـەتێکە، کۆمەڵێك پشت هەڵئەکەن لە تەڵـەبکردنی فـەتوا لـە زانایـان تێیانـدا و لـە جیـاتی ئـەوە هانـا بـۆ ئـەهواو ئـارا ئەبـەن، ئـەوانیش لـە هەڵـچوونی وتارخوێنــەکان و دڵناسـکی شـاعیرەکان و شـیکاری سیاسـیەکان و

هەواڵگـــەلی درۆی ئاشـــوبخێزی مونافیقەکانـــەوە وەردەگـــرن، وە کۆمـەڵێکیش عـەرزی زانایانیـان ئەکـەن، بـەڵام ڕازی نـابن بـە قـاڵ و مەقاڵیان، وەك ئەوەی ئەوان داوای وەڵامێکیان کردبێ موافەقەی هـەوای نەفسیان بکات و بگونجێت لەگەڵ هەوای نەفسیاندا، جا کاتێك ئەو وەڵامەیان دەست نەکەوت و بۆیان دەستەبەر نەبوو لێیان لائەدەن.

ئەمە دوو تەرەفەکە بوون، یاخوود دوو بەشەکە بوون لە خەڵك.

پاشـان باسـی وەسـەتەکەی یـاخود بەشـی سـێیەمی کـردووە و وتویەتی: وە ئەوانەی ڕزگار ئەبن لە ئاگری فیتنەکان، ساغ و سەلامەت ئـەبن لـە گـەرمای میحنەتـەکان, ئەوانـەن هانـا بـۆلای زانایـان ئەبـەن و پابەندیش ئەبن بە وتەکانیانـەوە، وە ئەگـەر وتەیـەك لـە وتـەکانیانی لـێ ئـاڵۆز بـوو گومـانی باشـیان پێـدەبات، ووتەکـەی خـۆی تـووڕ دەدات و وتەکـەی ئـەوان وەردەگرێـت، چـوون ئـەوان بـە ئـەزموون و شـارەزای شایەنترن و ئەهلن بۆیان، وە ئەگەر وتەکانیان جیاواز بوو، ئـەوە پابەنـد ئـەبێ بـە وتـەی جمهوریـان و سـەوادیانەوە (واتـە: زۆرینەیانـەوە) بـە ئیساردان بۆ سەلامەتی (سـەلامەتی دیـنی)، چوون سـەلامەتی (دیـنی) هیچ شتێك پێی یەکسان نابێت.

ئـای ئـەو وتەیـەی (ابن عاصم) چـەند جوانـە لـە (مرتقى الوُصول)دا فەرموویەتی:

وواجبٌ في مشكلات الفهم تَحسِينُنا الظنَّ بأهل العلم

واتــە: وە (واجــب)ە لەســەرمان لــە موشــكیلاتی تێگەیــشتندا گومانمان باش بێت بە ئەهلی عیلم.

وە لــە تێكــڕای موشــكیلات ڕەتكردنــەوەی زەلــلات و هەڵــەكانی زانایــان و مــەقالات و گوتارەكــانی ئــەهلی بیــدەع و موخالەفەكارانــە، ئەوانە ئەبێ زانایانی پایەدار و گەورە ، واتە: ئەوانەی زانستەكەیان لە دڵیاندا جێگیر بووە قسەیان تێدا بكەن وەك ئەوەی ئیمامی (شاطبی) لە (الموافقــات) و (ابــنُ رجــب) لـــە (جــامع العلــوم والحكــم)دا ڕوونیـــان كردووەتەوە، وە كاتێك تەڵەبەی تازەپێگەیشتوو و خەڵكە ڕەشۆكیەكە خۆیان لە (موشكلات) دەدا بۆ چوونەناو ئەم بابەوە، ئەوە ئاشوبگەلێك و بەڵاگەلێك پەیدا دەبێت وەك ئەوەی لەم سەردەمەی خۆماندا ئەبینرێ، جا بێگومان زۆرێك لە ئاشوبەكان كاتێك پەیدابوون كە هەندێك تازە پێگەیشتووی بێ ئەزموون تەعەروزیان بۆ وەڵامی زەللاتی زانایان و وتارگەلی موخالیفی شەریعەت كرد و وەڵامیان دانەوە، ئەوە ڕێگەی سەلامەت عەرزكردنیانە لەسەر زانایانی پایەدار و دەستگرتنە بە وتەی ئەوانەوە تێیاندا، وەك ئەوەی ئەبو موسای ئەشعەری كاتێك بینی ژمارەیەك لە خەڵك لە مزگەوت ئەڵقەیەكیان پێكهێنابوو تەسبیح و تەحمید و تەهلیلیان دەكرد لەسەر شێوازێكی جیاواز لەوەی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی لەسەر بوون، هانای بۆ ئیبنو مەسعود برد و بۆ ئەوی گەڕاندەوە، وە ئەمە بوو بە ئەسڵ لە عەرزكردنی هەموو زەللە و هەڵە و

بیدعە و مەقالە و وتارێکی موخالیفی شەریعەت و مەسەلەیەکی ئاڵۆز لەسەر زانایانی پایەدار.

## بنچینەی شانزدەهەم
## گەورە ڕاگرتنی کۆڕەکانی زانست و بەرزڕاگرتنی دەفرەکانی [15]

**کۆڕەکانی زانایان وەك کۆڕەکانی پێغەمبەرانن.**

**سهل بن عبدالله فەرمویەتی:** (مَن أراد أن ينظر الى مجالس الأنبياء فلينظر الى مجالس العلماء، يجيئ الرجلُ فيقول: يا فلان أيَّ شيءٍ تقول في رجل حلفَ على امرأته بكذا و كذا؟ فيقولُ: طلقت امرأتهُ، ويجيئُ آخر فيقول: ما تقول في رجل حلف على امرأته بكذا وكذا؟ فيقول: ليس يحنَثُ بهذا القول، وليس هذا الاّ لنبيّ أو لعالم، فاعرِفوا لهم ذلك)، **واتە: ئەوەی ویستی سەیری کۆڕەکانی پێغەمبەران بکات با سەیری کۆڕەکانی زانایان بکات، پیاوێك دێت ئەڵێ: فڵان چی دەڵێیت لەبارەی پیاوێکەوە سوێندی لە ژنەکەی خواردووە بەمە و بەمە؟ زاناکە دەڵێت: تەڵاقی ژنەکەی کەوتووە، وە یەکێکی دیکە دێت ئەڵێت: چی دەڵێیت لە پیاوێکدا سوێندی لە ژنەکەی خواردووە بەمە و بەمە؟ زاناکە دەڵێت: بەم وتەیە سوێندەکەی ناکەوێ، وە ئەمەش بۆ هیچ کەسێك نیە ئیللا بۆ پێغەمبەرێك یاخود بۆ**

---

١٥ دەفرەکان بە زمانی عەرەبی (أوعية)، مەبەست پێیان کتێبگەلی زانستی و هاوشێوەیانە، چوون وەك دەفر وان لە پاراستن و پارێزگاری زانستدا.

زانایەك نەبیٚ، ئەوە مافی زانایانە لە دوای پێغەمبەران جا ئێوەش ئەو مافەیان بسەلمێنن.

کۆڕی زانایان کۆڕی (خشوع) و سەکینە و وەقارە: ئیمامی مالیك کاتێك ویستبێتی فەرموده بگێڕێتەوە دەستنوێژی دەگرت و ڕیشی شانە دەکرد و لە پێشەوەی ڕایەخەکەی ژێری دادەنیشت و خۆی بە وەقار و هەیبەتەوە لە دانیشتنەکەیدا قایم دەکرد، پاشان فەرموودەی دەگێڕایەوە یاخود دەوتەوە.

عبدالرحمن بن مهدی هیچ کەسێك لە کۆڕ و مەجلیسیدا قسەی نەدەکرد و قەڵەمی تێدا دانەدەدا و هیچ کەسیش زەردەخەنەی تێدا نەدەکرد. وە زانستخوازان لە کۆڕ و مەجلیسی وەکیعی کوڕی جەڕاحدا دەتگوت لە نوێژدان.

ئەمە هەندیٚ لە ئاساری سەلەفییەت بوون، واتە: ئەوانەی سەلەفی صاڵحیان لەسەر بووە کە شێخ باسی کردوون.

پاشان وتوویەتی: لەسەر فێرخوازە کە هەقی کۆڕەکانی زانست بزانیٚ و بە ئەدەبەوە تێیاندا دانیشێت و گویٚ بۆ مامۆستا شل بکات و سەیری بکات و رووی هەر لەوبێت نەك بە پێچەوانەوە مەگەر لەبەر زەرورەت، وە کاتێك گوێشی لە قاووقیژ و هاوار و دەنگەدەنگێکەوە ئەبیٚ نەپەشۆکێت و لە شوێنی خۆی نەبزوێت و دڵی لەلای مامۆستا و وانەکە بێت، وە یاری بە دەستەکانی یاخود قاچەکانی یاخود هەرشتێك نەکات و لە خزمەتی شێخ و مامۆستاکەشیدا پاڵ نەداتەوە، وە

دەستیشی دانەنێتە سەر عەرز و خۆی بەسەردا بدات و ئح و ئح و جم و جوڵی زۆر نەكات و لەگەڵ هاوەڵی پاڵیشی ڕازی قسە دانەبەستێت، وە كاتێك پژمی دەنگی نزم و هێواش بكاتەوە، وە كاتێكیش باوێشكی هات دەستەسڕێك بەدەمیەوە بگرێت..

ئەمە هەندێك لە ئادابی شیاو بوون بە كۆڕ و مەجلیسی عیلم كە شێخ باسی كردوون.

پاشان وتویەتی: وە بەرز ڕاگرتنی دەفرەكانی زانستیش ئەوانەی زانستیان تێدا دەپارێزرێ ئەچێتە پاڵ تەوقیری كۆڕەكانی زانست، وە كۆڵەكەو ستوونیشیان كتێبن، وە ئەوەی لایق بێت بە زانستخواز:

پاراستنی كتێبەكەی و پارێزگاری كردنی و بەرزڕاگرتنی و بایەخدانە پێی، وە با كتێبی عیلم نەكاتە سندوقی سپاردەكان و بە شتەكانی پڕی بكات، وە نەشیكات بە كەڕەنا بەوەی لولی بكات و بینوشتێنێتەوە.. وە كاتێك لە جێگەیەك داینا بە هێواشی و لەسەرخۆ و بە بایەخەوە دایبنێت.

ئیسحاقی كوڕی راهەوەیی كە ئەوكات فێرخوازێكی سەرەتایی بووە كتێبێكی لەدەستدابوو لە جیاتی ئەوەی بە هێواشی داینێت تووڕی دەداتە جێگەیەكەوە، جا ابو عبدالله احمد بن حنبل چاوی لێدەبێت تووڕە ئەبێت و ئەفەرموێت: (أهكذا يُفعَل بكلام الأبرار؟!). واتە: ئایا ئاوها مامەڵە ئەكرێ بە فەرمانیشتی چاكان؟!

وە لـەکۆتایی ئـەم بنـچینەیەدا ئـەدەبێکی دیکـەی لـە جوملـە و تێکـڕای ئـادابی فێرخـواز لەگـەڵ کـۆڕی زانـستدا بـاس کـردووە و وتویـەتی: وە نـابیٚ لەسـەر کتێـب شـان دابدات، یـاخود لـەلای پێیـەوە داینیٚ [16]، وە کاتێـك لـەلای مامۆسـتایەك تێیـدا ئـەخوێنێت با لـەزەوی هەڵیبڕێت و بەهەردوو دەستی هەڵیگرێت و بیگرێت.

١٦ ئەم فەقیرە (مصطفى) ئەڵێت: هەروەها نابیٚ لەسەری بنووسێت و پیس و پۆخڵی بکات وەك ئەوەی هەندێك تەڵەبە و قوتابی لەسەر کتێب ئەنووسن و وەرەقەکانی ئەچەمێنەوە، وە نابیٚ بەدەستی ئارەقاوی و چەور و تۆزاوی و پیسەوە وەرەقەکانی هەڵبداتەوە، هەروەك ناشبێت چایی لەسەر بخواتەوە، وە من ئەوەم بە زیادیشەوە بە چاوی خۆم بینیوە، وە بووە چای لەسەر کتێب خواردوە، بنی پیاڵەکە لەسەر کتێبەکە دەرچووە ! یاخود دەستی تۆزاوی بوە جێگە پەنجەکانی بە تۆزەکەوە بەسەر کتێبەکەوە وەك مۆر دەرچووە !

## بنچینەی حەڤدەهەم
## بەرگریکردن لە زانست و پارێزگاری کردن لەسەرچاوەکانی

زانست حورمەتێکی زۆری هەیە، ئەگەر لە حاڵێکدا بە شتێك بەرهەڵستی بکرێت کە لەگەڵیدا نەگونجێت, ئەوە ئەو حورمەتە پێویستی ئەکات سەربخرێت. بێگومان ئەم سەرخستنە لەلای زانایان لە دیمەنگەلێکدا دەرئەکەوێ، لەوانە:

-وەڵامدانەوەی (موخالف)، جا ئەوەی دەرکەوت موخالەفەی شەریعەتی کردووە وەڵامی دەدرێتەوە هەرکەسێك بێت بە حەمیەت و پەرۆشی بۆ ئایین و نەصیحەت بۆ موسوڵمانان، ئیمام احمد فەرمویەتی: بەردەوام خەڵك هەندێکیان وەڵامی هەندێکیان ئەدایەوە، بەڵام پاڵێوراو بۆ ئەوە زانایانن نەك خەڵکە ڕەشۆکیەکە، ئەویش لەگەڵ پێویستی ئەدەب و تەرکی جەور و ستەمدا.

-وە لەوانە: وازهێنان لە ئەهلی بیدعەت و پشت تێکردنیان – ئەبو یەعلای فەڕاء بە کۆدەنگی زانایان باسی کردووە –بۆیە زانست لە ئەهلی بیدەع وەرناگیرێ، ئەسڵ تەرك کردنیان و پشت تێکردنیانە، بەڵام ئەگەر فێرخواز ناچار بوو ئەوە قەیناکا بە وەفقی ئەوەی

فەرمودەناسەکان بڕیاریانداوە لە ڕیوایەت لە ئەهلی بیدەعەوە، وەك ئەوەی بۆ خۆشیان ڕیوایەتیان لێیانەوە کردووە.

وە شیخ الاسلام ئیبنو تەیمیەی حەفید بنەمایەکی گەورەی تەقریر و جێگیر کردووە کە فێرخواز زۆر پێویستی پێدەبێت لە ڕۆژگاری جاهیلیەت و ئاشوبەکاندا و ئەفەرموێ: (فإذا تعذّر إقامةُ الواجبات من العلم والجهاد وغير ذلك الاّ بمن فيه بدعة مَضرَّتُها دون مَضرَّة ذلك الواجب، كان تحصيلُ مصلحة الواجب مع مَفْسدة مرجوحةٍ خيراً من العكس)، واتە: کاتێك بەرپاکردنی واجبەکان لە عیلم و جیهاد و غەیری ئەوەش موستەحیل بوو ئیللا بە ئەهلی بیدەع نەبێ زیانی بیدعەکەش لەو واجبە کەمتر بوو، ئەوە تەحصیلی بەرژەوەندی یە واجبەکە لەگەڵ مەفسەدە مەرجوحەکەدا باشترە لە عەکس و پێچەوانەکە.

-وە لەوانە: تەمێ و زەجری فێرخواز، واتە: مەنعکردنی فێرخواز کاتێك کە لە باسەکەی تەجاوزی کردبوو، یاخود مشتومڕێکی سەخت یاخود سوئی ئەدەبی لێوە دەرکەوتبوو، ئەوە تەمێ و زەجر ئەکرێ.

وە لە ئەحواڵی سەلەف ئەوەی عبدالرحمن بن مهدی و وەکیعی لەسەر بووە باسکردووە.

ئیبن مەهدی و وەکیع کاتێك کەسێك لە کۆڕ و مەجلیسیاندا قسەی بکردایە یاخود قەڵەمی دابدایە خاوەنەکەیان زەجر دەکرد و هەڵدەستان و دەڕۆشتن.

**وە چەندجار ئەمە لە شێخی شێخەکانمان** (ابراهيم آل الشيخ) **بینراوە، زۆرجار بووە بینراوە ڕۆشتووە کاتێك گوێی لە فێرخوازێکەوە بووبێ دەمی بادابێت لە قسەکردنیدا، نەعلەکانی هەڵگرتووە و ڕۆشتووە.**

**گەنجێك ئامادەی کۆڕی سوفیانی ثەوری ئەبێ، جا خۆی ئەکات بە سەرۆك و قسە ئەکات و پۆز بە عیلمەوە لێدەدات، سوفیان تووڕە دەبێ و دەفەرموێ:** (لم يكن السلف هكذا، لم يكن السلف هكذا، كان أحدُهم لايدّعي الإمامة ولا يجلس في الصدر حتى يطلُبَ هذا العلمَ ثلاثين سنة، وأنت تكبرُ على من هو أسُّ منك ! قم عنّي، ولا أراك تدنو من مجلسي)، **واتە: سەلەف وانەبوون، سەلەف وانەبوون، یەکێکیان ئیدیعای ئیمامەتی نەئەکرد و لە پێشەوەی مەجلیسدا دانەئەنیشت هەتا سی ساڵ تەڵەبی ئەم زانستەی دەکرد، کەچی تۆ تەکەبور ئەکەیت و پۆز لێئەدەیت بەسەر گەورەتر لە خۆتدا، هەڵسە لەلام بڕۆ و نەتبینم لە مەجلیسم نزیك ببیتەوە.**

**وە ئەیفەرموو:** (اذا رأيت الشابَّ يتكلّم عند المشايخ، وإن كان قد بلغ من العلم مبلغاً، فأيس من خيره، فإنه قليلُ الحياء)، **واتە: کاتێك گەنجت بینی لەلای مەشایخ و زانایاندا قسەی دەکرد (لە عیلمدا) وە ئەگەر لە عیلمیشدا گەیشتبووە مەبلەغێك ئەوە هیوابڕ بە لە خێری (واتە: چاوەڕوانی خێری لێ مەکە)، چوون کەم شەرمە، وە ئەوەی شەرمی کەم بوو، وەرەع و پارێزیشی کەم ئەبێ، وە ئەگەر وەرەع و پارێزیشی کەم بوو سەلبی عیلم دەکرێ. واتە عیلمی لێوەرئەگیرێتەوە.**

پاشان شێخ وتوویەتی: وە ئەگەر پێویستی کرد کە مامۆستا فێرخواز لە مەجلیسەکەی دەربکات بەمەبەستی تەمێکردن با دەریکات وەك ئەوەی سوفیان فێرخوازی دەرکردووە، وە وەك ئەوەی شوعبە یەکێك لە فێرخوازانی بەناوی عەفانی کوڕی موسلم لە دەرسەکەیدا دەرکرد، وە لەوەوە عەفان لە دواتردا بوو بە (حافظ) و زانایەکی گەورە و فەرمودەیەکی زۆریشی لە شوعبەوە ڕیوایەت کردووە.[17]

وە جاری وائەبێ فێرخواز زەجر و تەمێ بکرێ بەوەی لای بەلاوە نەکرێ و وەڵامی پرسیاری نەدرێتەوە، جا سکوت وەڵامە وەك ئەوەی ئەعمەش فەرموویەتی. وە ئەمەمان زۆر جار بینیوە لە کۆمەڵێك لە زانایان، لەناویاندا عەللامە ابن باز، زۆرجار بووە کەسێك پرسیاری لێکردووە لە شتێك سودی پێنەئەگەیاند، شێخ وەڵامی نەئەدایەوە و فەرمانی بە خوێنەر ئەکرد لەسەر خوێندنەوەکەی بەردەوام بێت، یاخود بە خیلاف و پێچەوانەی قەسدەکەیەوە وەڵامی ئەدایەوە، بە تەمێکردن بۆ فێرکار و پاراستنی حورمەتی عیلم، چوون پرسیاری وا هەیە هەقی پشتگوێخستنیەتی، وە ئەوەی هاوەڵێتی زانایانی کردبێ و بە ئەحواڵیان نەفسی خاوێن بوبێتەوە ئەمەی بە ئاشکرا لێیان بینیوە.[18]

---

١٧ خۆ ئەگەر لە جیاتی دەرکردن، فێری ئەدەبی (طالب العلم) بکرێت باشترە. مصطفى.

١٨ هەڵبەت من بۆ خۆم چەندین جار ئەوەم بینیوە کە کەسێك پرسیاری لە مامۆستایەك کردووە، ئەویش پشتگوێی خستووە. مصطفى

## بنچینەی هەژدەهەم
## خۆپاراستن ( **تحفظ** ) لە پرسیاری زانایاندا

ڕابکە لە مەسەلەگەلی سەر بە گێچەڵ و هەیبەت و سامی زانا بپارێزە، چوون مەسەلە هەیە شەڕنانەوە و بەخەبەرهێنانی فیتنە و بڵاوکردنەوەی خراپەی پێدەویستریێت، وە ئەوەی لە زانایانەوە لەم مەسەلەگەلەدا بەدی کردووە ئەو شتەیە لێیانەوە پێی گەشتووە سەرسامی ناکات، وەك ئەوەی تێپەڕی کرد لەگەڵت لە زەجر و جڵەوگیریی فێرخوازدا، جا لادان نیە لە خۆپاراستن لە مەسەلەی زانادا، وە ڕزگاری نابێ لە خۆپاراستنی تێیدا مەگەر کەسێك چوار بنەما بەگەڕ بخات:

یەکەمیان: بیرکردنەوە لە پرسیارەکەی بۆچی پرسیار ئەکات؟ ئەبێ قەسدی لە پرسیارکردن (تفقّه) و (تعلّم) بێت نەك (تعنت) کەللەڕەقی و (تهكّم) قەشمەری بێت، چوون ئەوەی قەسدی خراپ بوو لە پرسیارەکەیدا مەحروم ئەکرێ لەبەرەکەتی عیلم و مەنعیش ئەکرێ لە سوودی عیلم.

وە لەناو خەڵکدا هەیە پرسیار ئەکات و لە پرسیارەکەشیدا قەسدێکی شاراوە هەیە، بەوە ئەیەوێ بگات بە مەقصودێکی

(شاراوەی) خۆی، جا کاتێک موفتی غافڵ بوو لەوە و فەتوای بۆدا بەوەی ئەو ئەیەوێت پێی دڵخۆش ئەبێ و بڵاوی ئەکاتەوە، وە کاتێک هەستی پێکرد قەسدی چییە ڕێگر ئەبێ لەنێوان پرسیارکار و لە نێوان مەبەستەکەیدا، وە لە گومڕایەکەی ئەیگێڕێتەوە.

ئیمامی ئەلقەرافی لە کتێبی (الإحكام)دا فەرموویەتی: (جارێکیان لە قاهیرە پرسیاریان لێکردم دەربارەی گرێبەستی نیکاح، ئایا جائیزە یان نا؟ کەوتمە گومانەوە و وتم پێی – واتە بە پرسیارکەر –: فەتوات بۆ نادەم هەتا بۆم ڕوون دەکەیتەوە مەقسودت بەم قسەیە چیە، چوون هەموو کەسێك لە قاهیرەدا ئەزانێ کە گرێبەستی نیکاح جائیزە، جا وازم لێنەهێنا هەتا وتی: ئێمە ویستمان لە دەرەوەی قاهیرەدا گرێبەستەکە بکەین ڕێگری کراین چونکە حەڵاڵکردنە – مەبەستی نیکاحی تەحلیل و مارەبەجاش بوو، ئەویش جۆرێکە لە نیکاحگەلی حەرامکراو – جا هاتین بۆ قاهیرە، منیش پێم ووت: نە لە قاهیرە و نە لە غەیری قاهیرە جائیز نییە).

وە وێنەی ئەوە لە ئیبنوتەیمیەی حەفیدیش لە فەتوایەکدا کە پەیوەندی بە (أهل الذمة) وە هەبوو ڕووی داوە، ئەویش ابن القیم لە کتێبی (إعلام الموقعين) دا باسی کردووە، چەند جارێك وەڵامی درایەوە لە چەند ڕوویەکەوە غەیری ئەوەی پێشووی، ئەو هەر ئەیفەرمروو: (لايجوز)، هەتا لە ئاخر جاردا فەرمووی: (هي المسألة المعيَّنة، وإن خرجت

في عدة قوالب)، واتــە: ئــەوە هــەر هــەمان ئــەو پرســیارەیە، ئەگــەر چــی لەچەند قاڵبێكدا دەرچووبێت.

ئەمما بنەمای دووەم: وریابوونە لەوەی پرسیاری دەربارە ئەكات، جا پرسیار مەكە لـەوەی سوودی تیا نیـە، یـان بـە سـەیركردنی حـاڵی خۆت، یان بە نەزەر بۆ خودی مەسەلە و پرسیارەكە.

پیاوێك پرسیاری كرد لە پێشەوا ئەحمەدی كوڕی كوڕی حەنبەل دەربـارەی یـەئجوج و مـەئجوج و وتـی: ئایـا موسـوڵمانن؟ ئـەویش پێـی فـەرموو: (أحكمتَ العلمَ حتى تسأل عن ذا؟!)، واتـە: ئایـا زانسـتت تۆكمـە كردووە وا پرسیار لەوە دەكەیت؟!

ئــەمما بنــەمای ســێیەم: ئاگــا بوونــە لــە بــاری حــاڵی شــێخ بــۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەكەی، با پرسیاری لێنـەكات لـە حاڵێكدا مـەنعی بكـات، وەك ئـەوەی غـەمبار بێـت، یـاخود بـیری مەشـغوڵ بێـت، یـاخود بەڕێگەدا بڕوات، یاخود خەریك بێ سواری ئۆتۆمبێلەكەی بێـت، بـەڵ با چاوەڕوانی كـاتی لـەبار و گونجـا و بكـات كـە تێیـدا مورتـاح و ئاسـوودە بێت.

قەتادە فەرمویەتی: پرسیارێكم لە (ابو الطُفَيْل) كرد، فەرمووی: (إنَّ لكل مقامٍ مقالاً)، واتە: بۆ هەموو جێگەیەك وتەیەك هەیە.

وە پیاوێك دەربارەی فەرمودەیەك پرسیاری لە (ابن المبارك) كرد لە حاڵێكدا ڕێیـدەكرد، ئـەویش فـەرمووی: (ليس هذا من توقير العلم)، واتـە: ئەمە لە گرانڕاگرتنی زانست نییە.

وە (عبدالرحمن بن أبي ليلي) ڕقی لەوە بوو پرسیاری لێبکرێت لە حاڵێکدا ڕێبکات.

ئەمما بنەمای چوارەم: بێداری پرسیارکەرە لە چۆنیەتی پرسیارەکەیدا بە دەرهێنانی لە وێنە و صورەتێکی جوانی بەئەدەبدا، بەوەی لە پێشدا نزا بۆ شێخ بکات و حورمەت و ڕێزی بەرزڕاگرێت لە دواندنیدا، چوون نابێ قسەکردنی لەگەڵ شێخ و مامۆستاکەیدا وەك قسەکردنی بێت لەگەڵ ئەهلی بازاڕ و هەرچی و پەرچیدا.

جەعفەری کوڕی ئەبی عوثمان فەرموویەتی: ئێمە لەلای یەحیای کوڕی مەعین بووین، پیاوێکی پەلەکەر هات بۆلای وتی: (يا أبا زكريا حدّثني بشيءٍ أذكُرك به) باوکی زەکەریا شتێکم بۆ باس بکە واتە: فەرمودەیەکم بۆ باس بکە بیری تۆی پێبکەم ، ئەویش فەرمووی: (أذكرني أنك سألتني أن أُحدثك فلم أفعلْ!) بیرم بکە کە داوات لێکردم فەرمودەیەکت بۆ باس بکەم نەمکرد !

شێخ پاشان ئەڵێت: وە کاتێك ڕابمێنیت لەو پرسیارانەی دێنە لای ئەهلی عیلم لەمڕۆدا، لە زۆرێکیاندا سەلبی (تحفظ) و زشتی ئەدەب ئەبینی، ئەبینی هەیە بە گاڵتەجاڕییەوە یاخود ئیحتقار و سوکایەتیەوە پرسیار ئەکات، خەڵکێك هەیە پرسیار لە شتێك ئەکا ڕووی نەداوە، یاخود لە شتێك ڕوویداوە و سوودنابەخشێت، خەڵك هەیە وەختی گونجاو هەڵنابژێرێت، خەڵك هەیە لە عەرزکردنی خواستەکانیدا نەرم و

نیـانی نـانوێنیْ، پرسـیارەکانیان کلیلگـەلی ئاژاوەکـان و هۆکارەکـانی کارەساتەکانن، وای بۆیان بەهۆی ئەو کارانەی ئەیانکەن !

ئای ئەوانە چەندە نیازیان بە وتەکەی زەیدی کوڕی ئەسلەم هەیـە کاتێك پیاوێك پرسیاری لـە شتێك لێکرد، جا تێکـەڵی کـرد، زەیـد پێـی فـەرموو: (اذهب فتعلّم كيف تسأل، ثم تعالَ فسلْ)، واتـە: بـڕۆ فێربـە چۆن پرسـیار ئەکـەیت، پاشـان وەرەوە پرسـیار بکـە. ئەوانـە لـەمڕۆدا چـەندە پێویـستیان بــە هاوشـێوەی وتەکـەی زەیـدی کـوڕی ئەسـلەم هەیـە؟! بێگومان زۆر پێویستیان بە هاوشێوەی ئەو وتەیە هەیە.

## بنچینەی نۆزدەهەم
## شەیدابوونی دڵ بەزانست وزاڵبوونی بەسەریدا

ڕاستگۆیی تەڵەب بۆ زانست ئیجابی خۆشویستنی و وابەستەگی دڵ پێیەوە دەکات، بەندە ناگات بە پلەی زانست هەتا گەورەترینی چێژەکەی لەودا دەبینێت.

ئیبنوالقەیم لە (مفتاح دارُ السعادة)دا فەرموویەتی: (وَمَن لم يُغلّب لذّة إدراكه وشهوته على لذّة جسمه وشهوة نفسه، لم ينل درجة العلم أبدا)، واتە: وە ئەوەی چێژی دەرککردن و ئارەزووی زاڵ نەبێت بەسەر چێژی جەستە و ئارەزووی نەفسیدا، هەرگیز ناگات بە پلەی زانست.

بێگومان زانست بە سێ شت دەست دەکەوێ، ئەوانیش ئیبنوالقەیم لە کتێبی پێشوویدا باسی کردووە:

**یەکەمیان:** بەختکردنی توانا و تاقەت.

**دووەمیان:** ڕاستگۆیی تەڵەب.

**سێیەمیان:** دروستی نییەت و ئیخلاص.

ئەم سێ شتە جێبەجێ نابن ئیللا لەگەڵ دەفعکردنی هەموو ئەو شتگەلەدا نەبێ کە دڵ مەشغوڵ ئەکەن.

**وە ئەوەی ئەم چێژەی لە ئەحواڵی پێشووان لە زانایانی ئوممەت تاقی کردبێتەوە شتی سەیر ئەبینێ، جا زمانی وتاری یەکێکیان ئەفەرموێ:**

مالــــذّتي الاّ روايةُ مُسْنَدٍ　　　قد قُيدّتْ بفصاحةِ الألفاظِ
ومَجالسُ فيها تحِلُّ سكينةٌ　　　ومُذكــراتُ مَعاشر الحُفاظِ

**بێگومان چێژی زانست لەسەرووی چێژی دەسەڵات و حوکمەوەیە، ئەوەی زۆرێك خەڵك چاوی بۆی ئەڕوانێ و دارایی و سامانێکی زۆری لە پێناودا دەبەخشرێ و خوێنێکی فرەشی بۆ دەڕێژرێ.**

**ئەبو جەعفەری نەسەفی لەبەر دڵتەنگی و خراپی حاڵ و زۆری مناڵ بە غەم و پەژارەوە شەو ئەباتە سەر ، جا فەرعێك لە فروعی مەزهەبەکەی – مەزهەبی حەنەفی، چوون حەنەفی مەزهەب بوو –بیر ئەکەوێتەوە و پێی سەرسام و موعجەب ئەبێ، جا هەڵدەستێتەوە هەڵدەپەڕێ و دەفەرموێ:** (أين الملوكُ وأبناءُ الملوك؟ أين الملوك وأبناءُ الملوك؟)، **واتە: مەلیکەکان و کوڕەکانیان لەکوێن؟! مەلیکەکان و کوڕەکانیان لەکوێن؟!**

اذا خاض في بحرِ التفكُرِ خاطــري　　　على دُرَّةٍ من مُعضـلاتِ المطالبِ
حفرتُ ملوكَ الأرضِ في نيل ماحَوَوْا　　　ونلتُ المُنى بالكتُب لا بالكَتائبِ

**وە لەبەر ئەمە مەلیکەکان تامەزرۆ بوون بۆ چێژی زانست و هەستیان بە لە دەستانی دەکرد و هەوڵی تەحصیلکردنیان دەدا.**

**پیاوێـك ووتــی بــە ئـەبو جەعفـەری مەنـصور خەلیفـەی عەباسـی بەناوبانگ: ئایا لە خۆشیەکانی دنیا شتێك ماوە پێی نەگەیشتبیت؟**

**وتـی:** (بقيت خَصلةٌ: أن أقعد على مِصْطَبَةٍ، وحولي أصحاب الحديث – أي طُلاب العلم – فيقول المستملي: مَن ذكرت رحمك الله؟)، **یـەك خەسـڵەت مـاوە: ئـەویش ئەوەیـە لـە جێگەیـەکی بـەرز دانیـشتبم و زانـستخوازان دەورەیـان لێـدابم، ئیملاخـوێن بڵێـت: کێـت فـەرموو ڕەحمـەتی خـوات لێبێـت؟ یـانی: بڵێـت:** حدثنا فلان، قال: حدثنا فلان، **وە فـەرموودە بـە سـەنەدەوە بهێنێـت و بیگێڕێتـەوە و زانـستخوازان بینوسـنەوە، جـا سەیری نیازمەندی ئـەم خەلیفەیـە بکـە چەندە بەتاسە بووە بۆ لـەزەتی عیلم و تەڵەبی تەحصیلی و تەڵەبی وەدەستهێنانی و تامەزرۆیی بۆی.**

**هـەرکاتێك دڵ ئـاوەدان بـوو بـە لـەزەتی عـیلم، ئـەوا خۆشـیەکانی عادات ون ئەبن و نەفس لێی تووشـی حەپەسـان ئـەبێت. نـەضری کوڕی شـومەیل ئەفـەرموێت:** (لايجدُ المرءُ لذة العلم حتى يجوعَ وينسى جوعه)، **واتـە: ئینـسان هەسـت بـە چـێژی زانـست ناکـات هـەتا برسـی ئـەبێت و برسێتیەکەی لەبیر ئەکات.**

**بەڵ ئازارەکان لەزەتێك ئەگۆڕن بەم لەزەتە.**

**محمدی کوڕی هارونی دیمشقی ئەفەرمویٚ:**

لَمِحْبَرةٌ تُجالـــــسني نَهاري — أحبُّ اليّ من أُنس الصديقِ

وَرُزْمةُ كاغدٍ في البيأأأأت عندي — أحـبُّ اليّ من عِدْلِ الاقيقِ

ولَطْمَـــةُ عالمٍ في الخدّ مني — ألذُّ لـديَّ مِنْ شرْبِ الرحيق

**مِحْبَرةٌ : شوشەی مەرەکەب، رُزْمةٌ: بەند. عِدْلِ الدقيقِ: نيوبار ئارد. لَطْمَةُ: زلله. الخد: كولْم. الرحيق: خۆشاوی گوڵ.**

**سەرسام مەبە ئەم حاڵانە تەنها بەرکەوتنی عیشقی زانستن، ئیبولقەیم لە** (روضةُ المحبين) **دا ئەفەرموێ:** (وأما عُشّاقُ العلم فأعظمُ شغفاً به وعِشْقاً له من كل عاشق بمعشوقه، وكثير منهم لايَشغَلُه عنه أجملُ صورةٍ من البشر)، **واتە: ئەمما عاشقانی زانست لە هەموو عاشقێك بە مەعشوقەکەی زۆرتر شەیدابوون و عیشقیان گەورەترە بۆی، وە زۆرێکیان جوانترین شێوەی بەشەر مەشغوڵی ناکات لێی.**

**ئەم شەیدا بوونە لەکوێ و ئەوە لە کوێ کە حەز لە عورسەکەی**[١٩] **پێشدەخات بەسەر حەز لە دەرسەکەیدا؟ وە دانیشتنی برادەرانی شەو و پیرانی مانگەشەو بەلایەوە خۆشترە لە دانیشتنی لەلای زانایان !**

**وەدەتوانێ لە چۆڵەوانیەکان و بیابانەکاندا لە شوێنێك بۆ شوێنێك بگوێزێتەوە، بەڵام هێز و توانای ڕۆشتنی نیە لە گواستنەوەی زانیاریەکاندا ! وە چوست و چالاك هەڵدەستێ بۆ ڕاوی باڵندە، و تەمەڵ و تەوەزل ئەخەوێ لە ڕاوکردنی خێردا ! حەزی ئەوانە —**

١٩ عورس: **شایی و زەماوەند، ئەمە واتای (عُرس) بوو بە بۆری بە بۆری عەینەکەی، وە (عرِس) بە ژێرەی عەینەکەی واتە: بووك کەمەبەست ژنی مێردە کە تازە گوازرابێتەوە، وە بە ژێرەی عەینی (عِرس) واتاکەی ئاوای لێدێت: حەزی چێژ وەرگرتنی لە ژنەکەی پێشدەخات بەسەر حەز و بەشی لەدەرسەکەیدا و بەو هۆیەوە دەرسەکەی دەفەوتێت.**

وەزۆرێکیشیان – هیچ حەز و نەسیبێکیان لە تەعزیمی عیلمدا نیە، بەڵکو دڵەکانیان ئەسیرکراوە بەخۆشەویستی غەیری عیلم؟!

●برادەرانی شەو (سُمّار) ئەو برادەرانەن شەو دادەنیشن ڕازی قسە دادەبەستن و شەو بە قسە و باس بەسەر دەبەن.

●پیرانی مانگەشەو (شیوخ القُمْراء): پیاوانێکی تەمەندرێژن لە شەوانی مانگەشەودا کۆ ئەبنەوە باسی ڕۆژانی خەلیفەکان یاخود پاشاکان و دەسەڵاتداران دەکەن و مەجلیس بەوە گەرم ئەکەن و یەکێکیشیان نیە بزانێ دەستنوێژێکی جوان بگرێ بۆ نوێژ.

## بنچینەی بیستەم
## پارێزگاری وەخت لە زانستدا

**کاتێك زانست شەریفترین خواستراو بێت و تەمەن ببێچرێتەوە و وەك بەستەڵەك بتوێتەوە، جا خودی ژیری** (عين العقل) **پاراستنی وەختە لە زانستدا و ترسە لە هەڵوەشاندنەوەی بەبێ سوود، پرسیار کردن دەربارەی زانست لە ڕۆژی قیامەتدا من و تۆ هەڵدەنێت لەسەر موبالەغە لە ریعایەتکردنیدا.**

**ئیبنولجەوزی لە** (صيد الخاطر)**ەکەیدا فەرمویەتی:** (ينبغي للأنسان أن يعرف شرف زمانه، وقدر وقته، فلا يُضيِّع منه لحظةً في غير قُربةٍ، ويُقدِّم فيه الأفضلَ من القول والعمل)، **واتە: وا جوانە بۆ ئینسان کە ڕێز و قەدری کات و وەختەکەی بزانێ، و هیچ لەحزەیەکی لە غەیری نزیکێتی لە خواوە زایە نەکات و باشتر و باشتر لە وتە و کردەوە پێش بخات تێیدا.**

**زانایان زۆر گرنگی و بایەخیان بە کات داوە هەتا محمد عبدالباقی** البزّار **فەرمویەتی:** (ما ضيَّعتُ ساعةً من عُمري في لهوٍ و لعب)، **واتە: ساتێك لە تەمەنم لە گاڵتە و گەپدا بە فیڕۆ نەداوە.**

وە (أبو الوفاء بنُ عقيل) ئەو زانایەی کتێبی (الفنون)ی لە هەشت سەد بەرگدا نووسیوە فەرمویەتی (إني لا يحلُّ لي أن أُضيّع ساعةً من عُمري)، واتە: بۆ من حەڵاڵ نیە کە ساتێك لە تەمەنم بەفیڕۆ بدەم.

وە حاڵیان گەیاندبوونی بەوەی کە لە حاڵی خواردندا بۆیان بخوێنرێتەوە، بێگومان ئەحمەدی کوڕی سولەیمانی بولقاسی – کە لە تەمەنی بیست و هەشتساڵیدا وەفاتی کردووە – قیرائاتی لە حاڵی خواردندا بە قوتابییەکانی ئەخوێند لە ترسی بەفیڕۆچوونی وەختەکەی لە غەیریاندا، جا هاوەڵەکانی (قوتابییەکانی) بۆیان ئەخوێندەوە لە کاتێکدا نانی ئەخوارد.

بەڵ بۆیان ئەخوێنرایەوە لە کاتێکدا لە تەوالێت بوون. ئیبنوتەیمیەی باپیر کاتێك دەچووە تەوالێت بەهەندێك لە ئەوانەی دەوری ئەفەرموو: (إقرأ في هذا الكتاب وارفع صوتك)، واتە: لەم کتێبە بخوێنەرەوە و دەنگت هەڵبڕە.

وە ئەم لەبەرچاوگرتنە بۆ کات لەلای ئەوان ڕەحمەتی خوایان لێبێت لە چەندین مەعالیمدا ڕوون بووەتەوە کە حەزارەتەکان و شارستانیەکان تێکڕا پێی نەگەشتوون.

لەوانە: زۆری دەرسەکانیان، نەوەوی ڕەحمەتی خوای لێبێت هەموو ڕۆژێك دوازدە وانەی ئەخوێند لەلای مامۆستاکانی، شەوکانی خاوەنی (نَيلُ الأوطار) وانەکانی لە شەو و ڕۆژێکدا دەگەیشتە سیازدە وانە، هەیانبوو لەلای مامۆستاکانی دەیخوێند، وە هەیانبوو

قوتابیەکانی لێیان وەردەگرت، واتە: لەلایان ئەخوێند. وە مەحمودی ئالوسی خاوەنی تەفسیر زیاتر لەوان دەرسی ئەوتەوە، ئەو لە ڕۆژێکدا بیست و چوار دەرسی ئەوتەوە، وە کاتێك دەستی کرد بە تەفسیر و خەریکبوو بە فەتوا دانەوە کەمی کرد بۆ سێزدە دەرس.

پاشان لە تەرجەمە و ژیاننامەی محمد بن أبی بكر جماعە بینیومە کە دەرسەکانی لە شەو و ڕۆژێکدا گەشتونەتە نزیکەی پەنجا دەرس.

وە لەوانە: زۆری وتراوەکانیان، ئیبنوتەببان نزیکەی هەزارجار کتێبی (المدوَّنە)ی وتووەتەوە، وە لەهەندێك کتێبی عەباسی ئیبنو فارسی دا دەستکەوتووە بە خەتی خۆی نووسیویەتی: (درستهُ الف مرة)، واتە: هەزار جار ئیعادەم کردووەتەوە.

وە غالبی کوڕی عبدالرحمن ناسراو بە (ابن عطية) باوکی خاوەنی تەفسیری مەشهور کتێبی (صحيح البخاري) حەوت سەد جار تەکرار کردووەتەوە.

وە لەوانە: زۆری نوسراوەکانیان، ئەحمەدی کوڕی عبدالدائمی مەقدیسی – لە زانایان و شیوخی عیلم لە زانایانی حەنبەلی مەزهەب – بەدەستی خۆی دوو هەزار بەرگی نوسیوە، وە لە ئیبنولجەوزیشەوە شتێکی لەو شێوە ڕوویداوە.

وە لەوانە: زۆری خوێنراوەکانیان، ئیبنولجەوزی لە دوای ئەوەی لە تەڵەبی عیلمیشدا بووە بیست هەزار بەرگی خوێندووەتەوە.

وە لەوانــــە: زۆری مامۆســــتاکانیان، جـــا ئەوانـــەی ژمـــارەی مامۆسـتاکانیان لـە هـەزار تێپـەڕی کـردووە زۆرن لـەم ئوممەتـە دا، وە سـەیرترینی ئـەوەی باسـکراوە ئەوەیـە کـە ئـەبو سـەعیدی سـەمعانی ژمارەی مامۆستاکانی گەیشتووەتە حەوت هەزار مامۆستا، ئیبن نەجار لە کتێبی (ذَيْلُ تأريخ بغداد) دا فەرموویەتی: (هذا شيئ لم يبلغه احد) ئەمە شتێکە هیچ کەسێك پێی نەگەشتووە.

وە لەوانـــە: زۆری بیـــستراوەکانیان و خوێنراوەکانیـــان بەســـەر شـێخەکانیاندا لـە تەصـنیفگەلی درێـژ و ئـەجزای بچووك، بێگومـان بـە هــەزاران هــەزار دەژمێــردرێن وەك ئــەوەی لــە ئــیبن ســەنعانی و ئــیبن عەساکیری هاوەڵی (قوتابی) لە کۆمەڵێکی دیکە دا ڕوویداوە.

وە لەوانــە: زۆری موصــەننەفەکانیان، هــەتا لــە بــۆ کۆمــەڵێك لــە زانایــانی ئــەم ئوممەتــە هــەزار موصــەننەف ژمێــردراوە، لــە ناویانــدا عەبدولمەلیکی کوڕی حەبیب زانای ئەندەلوس و ئەبولفەرەجی جەوزی.

دوای ئـەوەی ئامۆژگـاری فێرخـواز ئـەکات بـە پاراسـتنی وەخـت و کۆتایی بە بەیتە شیعرێکی ئیبنوهوبەیرە ئەهێنێت کە فەرمویەتی:

والوقتُ أنفسُ ما عُنيت بحفظهِ وأراهُ أَسهلَ ما عليك يضيعُ

واتە: کات بەنرخترین شتە مەشغوڵ بووبیـت بـە پاراسـتنیەوە، وە وای ئەبینم سەهلترین شتیشە بەسەرتدا بڕوات.

## کۆتایی

شێخ کۆتایی بە کتێبەکەی هێناوە بەوەی تێیدا بانگەوازی تولاّبی عیلمی کردووە، و لە بانگەوازەکەیدا وتویەتی: ئەی موستەعی و تەڵەبەو قاسیدانی (فیقە) و ئەربابی علیم بنچینەکانی تەعزیمی عیلم جێبەجیٚ بکەن لە حاڵێکدا ئێوە ئەچنە سەر کورسیەکانی فێرکردن و سوودیا لێدەبینن و ستایشی پاشەڕۆژیشی دەکەن.

پاشان لە فەرمایشتی ئیبنولقەیم شتێکی باس کردووە کە ئەو خەسڵەتگەلە روون ئەکاتەوە کە ئەبیٚ ئەوەی تەڵەبی ئیمامەت ئەکات لە ئاییندا خۆی پێیان بڕازێنێتەوە، جا بیست و دوو خەصڵەتی باس کردووە، پاشان هەرهەمووی گەڕاندۆتەوە بۆ دوو شت و وتویەتی:

(وملاكُ ذلك هجرُ العوائد، وقطع العلائق) میلاکی ئەوە تەرککردنی عادەتگەلی خراپ و بڕینی پەیوەندیگەلی ڕێگرە لە نێوان بەندە و خواستراوەکەیدا.

وە ئیبنولقەیم لە جێگەیەکی دیکەدا (رفض العوائق)ڕەفزی لەمپەرەکانیشی زیادکردووە و (عوائق) لەمپەرەکان لە (علائق) پەیوەندییەکان جیاکردووەتەوە بەوەی (عوائق) ئەو لەمپەر و تەگەرە و بەربەستگەلە دەرەکیەیە لە خەڵکانی دیکەوە بۆ ئینسان دروست دەکریٚ، وە (علائق)یش (تعلّقات) و پەیوەندیگەلی داخلی قەلبیە.

جا تەحصیڵی خواستراوەکان ئەگەڕێتەوە بۆ سێ بنەما:

یەکەمیان: وازهێنان لە عادەتەکان (هجر العوائد).

دووەمیان: بڕینی پەیوەندییەکان (قطع العلائق).

سێیەمیان: ڕەفزکردنی لەمپەرەکان (رفض العوائق).

هەرکاتێك ئینسان تەحەرری ئەو سێ بنەمایەی کرد لە تەڵەبی مەقسودەکەیدا ئەوا پێی دەگات، واتە: هەرکاتێك گەڕا بەدوایاندا و هەوڵی بۆیاندا حاسڵیان ئەکات.

پاشان بە چەند نزایەك کۆتایی پێهێناوە. بەمشێوەیە هاتمە کۆتایی ڕاڤە و وەرگێڕانی ئەم کتێبە بەسوودە، لله الحمد والمنة.

وصلى الله وسلم وبارك على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين.

ڕۆژی ٢٥ / رجب /١٤٤٠ ك دەستم پێکرد و

لە ڕۆژی ١٥ / شعبان /١٤٤٠ ك لێبوومەوە، لله الحمد والمنة.